سامی سلێمان فەقی

# عەولا سەگ

رۆمان




هەولێر – ٢٠١١




وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی وچاپ وبڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

ناوی کتێب: عولا سەگ

نووسین: سامی سلێمان فەقێ

پیتچنین: نووسەر

نەخشەسازی ناوەڕۆك: سامی عەلی بندیان

چاپی یەکەم - چاپخانەی ڕۆشنبیری - هەولێر/٢٠١١

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (٢٤٥٥) ساڵی(٢٠١١)ی پێدراوە

-١-

بانگی نوویژی بەرەبەیان، بە هەمان شێوە، بێ زیاد و کەم... نزیکەی هەزار و چوارسەد ساڵ دەبێت... هەمان دەنگ و هەمان وشە و دەستەواژە... هەمان رەزم و هەمان ئاواز... لە هەمان شوێن و هەمان کات... بۆ هەمان مەبەست... رۆژانە دووبارە دەبۆوە، ئەو پرسیارە سامدارەی لێرەشدا خۆی دەنوێنێت و خاوەنەکەی بە چەنباز و گومان لێکراو و گومڕاویی ناوزڕاو دەکات، ئەوەیە: ئایا ئەم بانگەوازە پیرۆزە لە کۆمەڵگای ئێمە تا چ رادەیەك توانیویەتی دادپەروەری بنوێنێت و بنەماکانی رەوشت بچەسپێنێت؟! یان کام جۆرە رەوشتیکی چەسپاند؟! بە واتایەکی تر، ئایا بە گوێرەی هەڵوێست و بیروبۆچوون و روانگەو تێڕامان و تێڕوانین و تێبینین و... هتد ئەم کۆمەڵگایە، کە سەرەڕای ئێرانییە زێدەڕۆییەکەی هێشتا هەر کۆمەڵگایەکی سواندن و نێبەرە، بە کام سەنگ و کام پێوەر، رەوشتبەرزی و بەدڕەوشتی رەفتارەکان هەڵدەسەنگێنێت؟!... هەر چۆنێك بێت، ئەم بەناوبانگترین و باوترین دەنگە، نەخوازەڵا پاش داهێنانی ئامێری بلندگۆ، نەك هەر منداڵانی ناو بێشکەی دەگریاند و دایکانی زەغەل و خەوگرانی توورە دەکرد، بگرە ئەو دەنگە بەرز و بە سافە، زیاتر لە هەر کەسێك، ئاغای دێیەکەی جاڕس دەکرد:

- سەگە... عەولا سەگ؟

لە سەر هەمان نەریتی رۆژانە، ئاغا بە فەروە گرانبەهاکەی سەر ملی لە ژوورە تایبەتیەکەی بە ناڕەحەتی هاتەدەر و بەرەو ناو رەز وباغی کۆشك و تەلارەکەی شۆڕبۆوە، عەولاش وەك جاران، کە لە دیوەخانەکە نووستبوو، لە گەڵ ئەو بانگکردنە پڕ شکۆدارەی، بە راچڵەکین لە شوێنی خۆی راپەڕی... بەدەم باوێشکدان و زینندە خەوەوە، لە چاپەستی سەر سۆپە دارەکە، ئاوی مەسینەکەی شلەتێن کرد و خێرا گەیاندیەی ناو

ناودستی باخچەکە، لە بەردەرگای ئاودەستەکەش، خۆی چەماندەوە و فەروەکـەی لـە سەر ملی هەڵگرت و بە ترس و لەرزەوە:

- بە سەری ئاغام، لە سەر فەرمانی ئێوە، ئەمجارەیان هەر بە دەسـتی خـۆم رووی ئەو ئامێرە نەفرەت لێکـراوەم بـۆ لایەکـەی دیـی گـۆڕی، بـەڵام نـازانم چ سـەگبابێکە دەستکاریی کردۆتەوە؟!!

تاکو ئاغا کارەکەی ئەنجام بدات، ئـەوەك پێویـستی بـە ئـاوی زیـاتر هـەبێت، ئـەو مەسینەیەکی تریشی داگرت و خاولیەکـەی لـە سـەر شـانی دانـا و لـە دوورەوەی ئـاو دەستەکە بە چەند هەنگاوێك وەستا.

بیـست و پێـنج سـاڵ دەبێـت، عـەوڵا رۆژانـە بـەو دەسـپێکە، وەك کاتـژمێرێکی قورمیشکراو، بێ وچان خزمەتی ئاغاکەی دەکـات، خـۆ لـە پێـشتریش هـەر خزمـەتی دەکرد، بەڵام بە شێوەیەکی تر... ئەو هیچ زانیارییەکی لە سەر بنەماڵـەی نـەبوو، زۆری هەوڵدا شتێك دەربارەی رەگەز و رەچەڵەکی بۆ دەرکەوێت و هـەر بـەو هۆیـەش تووشـی دژوارترین نەهامەتەکانی ژیانی هات و رەسەنایەتییەکەیشی هەر بە نەزانراوی مایـەوە، لە سەر قسەی پیرەژنەکان کە جاروبار عەوڵا لە کـاتی منداڵیـدا بـە دزیـەوە گـوێی لـە چرپەیان شلدەکردەوە، گوایە ئەو ئافرەتە کاتی خۆی پاش ناوزڕاندنی لە گـەڵ دڵـدارێکی شەوانەی، بە هەرحاڵ و بە دەردەسەری خۆی دەگەیێنێتە ئەو ناوچەیە و بە یارمەتی ئاغـا رزگاری دەبێت تاکو هەتاهەتا ئەو رووڕەشیەی بە نێوچاوانی عەوڵاوە هەڵواسێت، کاتێك لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنی دێیەکە، بۆ قورئـان خوێنـدن، ملـی حـوجرەی مزگـەوتیان گرتبوو... یەکێکیان بە ناوی عەلاوەدین بەگاڵتەبازییەوە گوتی: عەوڵا تـۆ ئەگـەر هـەر دوازدە عیلمەکە لە بەرکەیت، ئەو کاتە بە مەلا زۆڵ بانگ دەکرێیـت... لـە گـەڵ ئـەو سووکایەتی پێکردنە، هۆشی نەما، بـە تونـدی پـەلاماری داو لەگـەڵ مـستێك دای بـە زەویدا... منداڵەکە بەگریان بەرەو ماڵەوە رایکرد... زۆری نەخایاند، دایك و باوکی، بە پۆڕەپۆڕ و هات و هاوارەوە، هاتنە لای مەلا و سەرئەنجام بێ پرس و لێکۆڵینەوە، عەوڵا

لـه حـوجره دەركـرا... بـه دڵێكـی شكەسـت بـەرەو حەوشـه بـێ سـەر و بەرەكـەیان گەڕایەوە... ڕێ و ڕێ، بە دڵێكی پڕ رق و كـین تەماشـایەكی ئاسمـانی كـرد، پـەڕەكانی جزوعەمەی لەت و پەت كردن، بە بازدان و بێ ئاوڕدانەوە بەرەو ماڵەوە هەنگاوی نـا...
دایكە داماوەكەی لە گۆشەیەكی حەوشـەكە نـانی دەبرژانـد... ڕەشـۆی سـەگیان چـەند هەنگاوێك دوورتر راكشابوو و پارچەنانێكی لەبەر دەم بوو، ئەویش بە دامـاوی هـەر لـە تەنیشت ڕەشۆ دانیشت، بە وردی سەیرێكی سەر و سیمای دایكی كرد، ژنێكی زۆر جوان بوو، بەژن و باڵایەكی بێ هاوتای هەبوو، لە هـەموو ژنـانی دێیەكـە جـوانتر بـوو، ئـەو دەیزانی جل و بەرگە قەشەنگەكانی دایكی بەرماوەی ژنانی بنەماڵەی ئاغان، ئـەوی زۆر خۆشدەویست، بۆیە نەی دەویست بە هەمان پرسیار، دڵە گەورەكەی بشكێنێتەوە، بەڵام تانە لێدانی خەڵك و دەركردنی لە خوێندن، ئـەو ڕۆژە كاریگەریـەكی زۆری هـەبوو، زۆر جاڕس ببوو، بە سەرزەنشتەیی و چاوێكی پڕ گومان ڕووی تێكرد: دایە پێت نەگوتم باوكم كێیە؟... هەروەك بڵێن ئەویش ئاگاداری بەسەرهاتی ئەو ڕۆژەی ببوو، بە چـاوانێكی پـڕ فرمێسك سەیرێكی كرد و خۆی بێدەنگ كرد... كەچی ئەو ساتە ئەو هەر مكووڕ بوو لە سەر یەكلاكردنەوەی ئەو بابەتە دژوارە، كە هەمیشە زەلیلی دەكرد و هەر بەو هۆیەشەوە حەزی دەكرد خوێندنی حوجرەی تەواو كات، تاكو هەر هیچ نەبێت، ڕێزی خەڵكەكـە بـۆ خۆی بە دەست بێنێت، بە خرۆشاوی پێی لە سەر پرسیارەكە داگرتەوە و پێیگوت: ئـاخر منداڵەكان پێم دەڵێن دایكت شوی نەكردووە... یەكەم جاری بوو، بتوانێت بەو شـێوەیە، بە دڵێكی قاییم هەست و نەستەكانی ئاخی دارێژتـە نـاو ئـەو رسـتە ترسـناكە تـا وەك گوڵێكی بەساڵاچوو ڕەنگی ڕووخساری دایكی هەڵگـەڕێنێت، لـە سـەرخۆ كەرسـتەكانی نـانكردنی بەجێهێـشت و بـەرەو ژووره بـێ سـەرو بـەر و تاقانەكـەیان ڕۆیـشت، پـاش ماوەیەكی كەم، بەروویەكی خۆشەوە گەڕایەوە، بڕە پارەیەكی زۆری خستە ناو دەسـتی و گوتی: بڕۆ بنێشتێكم بۆ بكڕە، هەركە گەڕایتەوە هەموو ڕاستییەكانت بۆ ئاشكرا دەكەم، ئەویش هەر كە سەیرێكی بڕە پارەكەی كرد بە ڕامان گوتی: بەڵام دایەگیان ئـەم پارەیـە

زۆره... بەزەردەخەنەوە گوتی: قەیناکە با لەمەودوا هەموو پارەکان لای تۆ بێ، ئەی تۆ پیاوی ئەم ماڵە نیت؟... بە دڵێکی گەش و لە خۆباییەوە، وایدەزانی تانجی پاشایەتییان لە سەرناوە، وەك بەگزادەکان بەرەو دوکانەکە هەنگاوەکانی دەهاوێشت، هەر کە گەیشت، بە ئەنقەست هەموو پارەکانی لە گیرفانی خۆی دەرهێنایەوە و لە پێش چاوی خەلکانی بەر دوکانەکە، دووسێ جار سەر لە نوێ دەستی بە ژماردنیان کردەوە، بە لاچاوێکیش سەیری ئەوانی دەکرد، کە واقی ورماو چاویان بڕیبووە پارەکانی دەستی، ماوەیەك بە بەهانەی تێڕامانی شت و مەکەکان خۆی دواخست، ئینجا بنێشتەکەی کڕی و بە سووکی تەماشایەکی تری خەلکەکەی کردەوە، لە سەرخۆ و بە گەشبینی بەرەو حەوشەکەیان گەڕایەوە،بەلام چ گەڕانەوەیەك؟! گەڕانەوەیەکی مردوو!! گەڕانەوەیەك بۆ نهۆمێکی تری ناگرخۆشتر و ئێشدارتر و وەڕستری دۆزەخ!! یەکسەر لە بەهەشتێکی کاتی بۆ دۆزەخێکی هەمیشەیی، گەڕایەوە، تاکو بزانێت رۆژگار چ چارەنووسێکی رەشتری بۆی ئامادە کردوە؟!... خەلکانێکی زۆر، کە زۆربەیان نافرەت بوون بە هەرەوەزی بەرەو ماڵیان هاواریان دەبرد، هەندێکیانیش لە دەوروبەری جەستەیەکی سوتێنراو گلێر ببوونەوە، هەر لە بەر دەرگای حەوشەکە، ماوەیەك بە گەشکەیی و دڵەڕاوەکی وەستا و چاوی بڕیە حەشامەتەکە، ئینجا لەگەڵ بیستنی نالینی دایکی، هاواری کرد و خۆی هاوێشتە ئامێزی و: دایە بۆ خۆت سووتاند؟... وەك فریشتەیەك بە زەردەخەنە لە رووخساری وردبۆوە و گوتی: دڵم نەدەهات لە کاتی خۆی بە جێت بێلم، ئاگاداری خۆت بە، بۆمن نەگریێ، من لە مێژە مردووم و......!!... ئیتر لەگەڵ ماڵئاوایی لێکردن وپچڕانی دووا هەناسەکانی، قیژانی ئەو و حەپانی رەشۆی سەگیان، تاقە شیوەن و گریانی ئەو ماتەمینیە بوون، جگە لە هەردووکیان، کەسی تر شیوەن و پرسەی بۆ نەکرد... هەندێك ژن دەگریان، بەلام نەك بۆ چارەنووسە دڵتەزێنەکەی ئەو ژنە بەسەزمانە، بەلکو بۆ هات و هاواری ئەو و نوزە نوزی سەگە داماوەکە، کە ئەویش وەك خاوەنەکەی بەرامبەر تەرمەکە چڕنووکی پاشی لە زەوی گیرکردبوو و جار و بار بە

ساردیەوە دەیحەپاند... ئەوەی کارەساتەکەی دژوارتر کرد و زیاتر هەراسانی کرد، دەمەقالە سەختەکەی باوکی نەسرین بوو، ڕێی نەددا لە گۆڕستانەکە، تەرمەکە لە تەنیشت گۆڕی باوکی بنێژن... ئەگەر هەرەشەی یەکێك لە پیاوانی ناغا نەبوایە، بارەکە ئالۆزتر دەبوو... کەسانی تریش کە مردوویان لە گۆڕستانەکە نێژرابوو، بۆ پاڵپشتی ئەو پیرەمێردە، بە مۆن و گرژی سووربوون لە سەر ئەوەی دەبێت تەرمی ئەو جۆرە کەسانە لە دووری گۆڕستانەکە بنێژرێت، ئەو هەڵویستە ڕالێنەبینراوە هەموو ڕەوشتێکی جوانی لێکوشت، خونچەی ئاواتەکانی هەڵوەراند، دڵنیابوو کە نەك هەر ئەو کۆمەڵگا ئالەبارە لە ئامێزی ناگرتەوە، بگرە ئەویش ئیتر چاوی لە ئامێزی ئەو دڵڕەقانە نەما... بووە دوژمنی خەڵك و خوا و پێغەمبەر... بووە لایەنگیر و بەرخەوانی ئاغا... ئیتر شوانێکی بە نان و سك... ڕەنجێك تەنها بەرامبەر دوورکەوتنەوەی لە جیهانی ئادەمیزادان، لە ڕاستیدا دوورخستنەوەی لە ئانەلێدان و تیڕامانە پڕ گومانەکەی ئەو ئالەبارانە ئارامتری کردەوە... ئیتر هەموو کاتەکانی لە ئاقاری دێیەکە و لە بناری چیاکان ڕادەبوارد... لەبەرەبەیانەوە تا ئێوارەی درەنگ، لەگەڵ ڕەشۆی سەگی بەگەمە کردن دەیانبردەسەر و چاوشارکێیان دەکرد... نەك هەر ئەو، بگرە ڕەشۆش حەزی لە تێکەڵی هاوڕەگەزانی نەبوو، کە لە سەگێکی دێیەکە ڕاستدەهات، بە شەرمەزاری ڕووی خۆی دەگۆڕی، نەبیسترا جارێك ئەو بەستەزمانە لە گەڵ حەپێنی شەوانەی سەگانی دێیەکە بەشداری بکات... ڕەشۆ ئەو ناوەی لە ڕەنگی پێستی وەرگرتبوو، سەگێکی هەوشار لە گورگێکی زەبەلاح دەچوو، زۆر بە توانا و بوێر و نەترس بوو، جارێکیان سەگی پیرەژنێك پەلاماری قەلێکی دایکی دا کەچی ڕەشۆ بە چاوترووکانێك گەیشتە سەر پشتی و دەستبەجێ هەناسەی لێ بڕاند، خۆ ئەویش ئاگای لە چڕەی پیرەژنەکە بوو، کاتێك لە دیار لاشەی سەگەکەی بە بۆڵە بۆڵ دەیگوت: سەگی ئەم قەحپەیە وەك خاوەنەکەی زۆڵە... سەگێکی زۆر ژیر و گاڵتەچی بوو، جارێکیان دایکی لە سەر بانی خانووەکەیان بانگی کرد تا گسکەکەی بۆ بەرێت، کەچی ڕەشۆ پێش ئەو پەلاماری

گسکەکەی دا و گەیاندیە دەستی دایکی و وەك گاڵتەپێکردنێکیش هەر لە سەر بانەوە بەروویدا حەپاندی، بەو سووکایەتی پێکردنەی زۆر نارەحەت بوو، گوچانێکی بە دەست گرت و بە بازدان سەرکەوتە سەربان تاکو دارکاری بکات، کەچی ئەو ساختەچییە وەك کەسێکی شارەزا خۆی لە پشت دایکی حەشاردابوو، سەگێکی ئەمەکداربوو !! پاش مردنی دایکی بۆ یەك چرکەش لێی دانەدەبڕا، لە کاتی شوانی و بەرخەوانی کە لە ئاقارا دەخەوت، لە پشت سەری دەوەستا و بە وریایی چاودێری رانە مەڕەکانی دەکرد، زۆر شارەزابوو لە لەوڕاندنی مەڕوماڵات، نەیهێشت رۆژێك یەك دانەش لە رانەکە دابڕێت و ونبێت، یان گورگێك بوێرێت هەرێمی مەڕەکانی بێت، شەو و رۆژ، وەك باوکێکی دڵسۆز بەردەوام چاوێکی پێیەوە بوو، زۆر هۆگری یەکتر ببوون، وەك کوڕ و باوکێك، یان دوو برا یەکتریان ماچ دەکرد و لە ناو یەك قاپدا نانیان دەخوارد و لە خەوتندا سەری خۆیان پێك دەکرد... خولامەکانی تری ئاغا بە سووکی رەفتاریان لە گەڵ دەکرد، پێیان دەگوت کە جیاوازیی لە گەڵ سەگەکەی نییە، گلاوە و دەبێت حەوت جار بە قوڕی رەش خۆی بسمیل بکات، ئەگەر نا، بە هیچ شێوەیەك نابێت دەستی خۆی لە پەرداخ و قاپەکانی خواردن بدات...لە راستیدا، خۆ ئەویش لە ناخەوە حەزی دەکرد وەك رەشۆ ببێتە سەگ، زۆر جار وەك ئەو، بە چوارپەلی بەرامبەری دەوەستا و زۆرانبازییان دەکرد... خۆی لە جیهانی درۆ و فێڵ و چاوچنۆکی ئادەمیزادان دوورخستەوە، لە گەڵ جیهانێکی بچکۆلانە خۆی گونجاند... مەگەر لە سەر فەرمانی ئاغا و خولامەکانی، جار و بار، هات و چووی ئەو جیهانە ترسناکەی بکردایە، ئەگینا دەستی لە حوکمڕانی میرنشینەکەی بەرنەدەبوو... کە تێکەڵی گەندەڵییەکانیان دەبوو، هەستی دەکرد نوقمی ناو دەریایەکی بۆگەن بووە و نیتر تا کو نەخنکێت دەم و چاوەکانی دادەخستن و لە گەڵ ئەنجامدانی راسپاردەکان بە خێرایی دەگەڕایەوە ئامێزی ژیانە سادەکەی... نەك بە رۆژ، بگرە شەوانیش حەزی دەکرد لە چۆڵاییەکان بمێنێتەوە... هەموو پەیوەندیەکانی دەرەوەی پچڕاند و خۆی لە گەڵ ئەو پەڕی ئازادی راهێنا... کەچی جارێکی تر رۆژگاری رەش،

سووی لەو ژیانەشی بوو، وازی لێنەهێنا و ئەو جیهانە سادەیەشی لێرماند... ئای لەو رۆژە رەشە، شەوێك لە كاتی سەردانی گۆڕی دایكی، رەشۆ لە پڕێكا سەری نایە سەر گۆڕەكە و بە تێرامانێكی پڕ سۆز، چاوەكانی بریە چاوانی، پەیتا پەیتا پیلۆكانی دادەخران، ئینجا لە گەڵ هەنسكێك، ئەویش ماڵئاوایی كرد و مرد... هێشتا تەمەنی یانزە ساڵی بوو... ئیتر هەر خوا خۆی دەزانێ چەند گریان و باوە رۆیەی بۆ كرد... دەست و قاچەكانی ماچكردن... هەزار و یەك تفی بەرەو ئاسمان هەڵدا، چەندین جار لە خۆی چوو، ئێستاش دڵنیا نییە، لە باری وشیاریی دابوو یان لە بێهۆشی... لە ناكاو رووبەڕووی هەردووكیان بووەوە، بە رواڵەتی دوو فریشتەی دەم بە خەندە لە دیار سەری وەستابوون، تیشكی رووناكیەكانیان سەرانسەر دونیای داگرتبوو، دەست بە ئەژنووە بەرامبەریان دانیشتبوو، لێیان پاڕایەوە تاكو جێی نەهێڵن، گوتیان ئێمە ئەو ژیانەمان بەسە، داوای كرد ئەویش لە گەڵ خۆیان ببەن، گوتیان هەر كەسێك و كات و ساتی خۆی، تۆ پەیامێكت پێ راسپێردراوە و دەبێت تەواوی كەیت، دونیایەك فرمێسكی رشت، لە پڕێكدا هەستی بە ئارامیەكی دەروونی كرد، بە رووخۆشی ماڵئاواییان لێكرد، لە دیار تەرمەكە خۆی بینیوە، دوو سێ تەنەكە ئاوی لە كانییەكە برد و تەرمە پیرۆزەكەی جوان شووشت، لە حوجرەی مزگەوتدا پارچە پەڕۆیەكی سپیی دزی و بەڕێك وپێكی كفنی كرد... هەر بەو ئەوەش بێڵ و تەورێكی دەستكەوت و ئەو گۆڕەی كە باوكی نەسرین نەیدەهێشت تەرمی دایكی لە تەنیشتی بنێژرێت، هەمان كۆنە چاڵەكەی هەڵكەندوە و لاشەی رەشۆی تێیدا نێشت و دایگرتەوە و خۆڵەكەی جوان پەستایەوە و بە چەندە ئایەتێكی قورئان ماڵ ئاوایی لێكرد... نەمانی رەشۆ زۆر پەریشانی كرد... دوا خونچەی نومێدی لێ هەڵوەراند... بە یەكجاری رەشبین و بێزاری كرد... ئیتر لە ناو خولیای یادگاریەكانیدا نوقم بووەوە... بە رۆژ شوان و بە شەویش لە سەر گۆڕی رەشۆ و دایكی دەنووست... بە چاكی زانی و بڕیاریدا لە گەڵ ئەو جۆرە ژیانەش بگونجێت و خۆی نەداتە دەست مرۆڤەكان... زۆری نەخایاند، توانی رابێت و چێژ لەو تەنیاییەش

وەرگرێت... لە راستیدا هیچ شتێك لە دالغە لێدان خۆشتر نییە... ژیانێکی خۆشگوزەرانی ئەندێشەیی...هەموو شتێکی تێیدا دەستدەکەوێت، هەر خۆت بالادەست و دەسرۆی، بە ئارەزووی خۆت و بێ هیچ سانسۆرێك، ئەوەی خودا ئافراندویەتی و لات قەلب و نادروستە هەڵی دەوەشێنیەوە، سەر لە نوێ، بە کەیفی خۆت و بە شێوەیەکی نایابتر رێکیان دەخەیتەوە و دەیانهێنیە کایەوە، خۆت پاڵەوانی بێ هاوتای ئەو دونیایەیی و قورپەسەر ئەژدیها و زووحاك و تێکرای درندەکان... ئیتر عەولاش تا رادەیەك کەوتە دالغە و بیرکردنەوە، لە سەر قسەی خۆی خەریك بوو ببێتە پێغەمبەر، ئەو زۆرجار بە مەلا سالحی دەگوت ئێ بێ قەزابی خۆ ئەوانیش هەر بەو جۆرە پەیوەندییان لە گەڵ جیهانەکەی تردا کردووە و بووینەتە پێغەمبەر... ئەو زۆرجار بەرامبەر مەلا سوێندی بە سەری ئاغا دەخوارد کە نەك هەر جارێك و دووجار، بگرە دەیان جار لە کاتی قووڵی بیرکردنەوە و بورانەوەیدا، خودای بینیوە، بەلام هەر جارەی بە رەنگ و شێوەیەك، هەندێ جار بە رواڵەتی مرۆڤ و هەندی جار لە شێوەی ئاژەڵەکان، هەر چەندە شێوەکانی لێك نەدەچوون، بەلام بە قسەی خۆی ئەو دڵنیابوو کە هەموویان هەر هەمان خودان، ئیتر خەریك بوو ببێتە پێغەمبەر و بانگەوازێکی نووێ هەڵبدات، خەریك بوو هاوار بکات و بڵێت بەسە ئیتر رق و کین، ئیتر با رق و کین تاقە پێوەری هەلسەنگاندنی گیانلەبەرانی بەهەشت و دۆزەخ بێت، با دروشمی ئەمان بۆ رق و کین دوا پەیامی مرۆڤایەتی بێت، خەریك بوو هەموو دونیا کۆنترۆڵکات و دادپەروەرییەکی رەها بنوێنێت، هەموو لاسەنگێك هاوسەنگکاتەوە، خەریك بوو بە یەك فتوا رق و کین لە سەرانسەر جیهان حەرامکات، فەرمایشتێك راگەینێت و بەیەکجاری کەسانی بەدرەوشت و بەد ئاکار و بەدنیو و بەد بێژ قەلاچوو بکات، بەلام نەیانهێشت، ئەمجارەش وازیان لێی نەهێنا ،لە شەوە زەنگێکدا، دەستەیەکی خەلکی دێیەکە شوێنی کەوتن و دەستگیریان کرد و بەرەو دیوەخانی پەلەکێشیان کرد، بەرامبەر ئاغایان وەستاند... ئەویش بە تورەیی رووی تێکرد و گوتی: عەولا لە کوێ بووی؟... بە ترسەوە گوتی: گەورەم ویستم سەردانی

گۆڕی دایکم بکەم کەچی هەر لە گۆڕستانەکەدا، خۆنەویستە خەوم لێکەوتبوو... کەچی ئەو بە گرژی هەستایەوە و لێی نزیك بۆوە و: عەولا درۆ مەکە، راستیم پێ بلێ، وامزانیوە سالآنێکە حەزت لە شەوبێری ناو گۆڕستانە... بۆ حەزت لە گەڕانەوە نییە؟... لە گەڵ ئەو پرسیارە چاوانی پڕبوون لە فرمێسك و نەیتوانی وەلآم بداتەوە، ئەویش بەو فرمێسکانە تووڕەییەکەی داهاتەوە و دەستی لە سەر ملی دانا و بە شێوەیەکی نەرمتر: پێم بلێ کێ دڵی شکاندوی؟ بلێ مەترسە... کوڕم من ئێستا سەرپەرشتیار و پشتگری تۆم... کێ ئازاری داوی؟ تا هەر ئێستا تەفرو تونای بکەم... گوتی: هەر خۆم حەزم لە تەنیاییە... ئەویش لە سەرخۆ گوتی: کوڕم بەم تەنیاییە بە روالەتی شێتانت گرتووە... ناکرێت مرۆڤ لە کۆمەلگا دوورکەوێتەوە، ئەگینا شێت دەبێت و توشی چەواشەبوون دەبێت... بەشەرمەوە گوتی: ئاخر ئەوان بە چاوێکی سووك رەفتارم لەگەڵ دەکەن، حەز لە دیدەی من ناکەن... لە گەڵ ئەو وەلآمەی، دەستی لە سەر ملی هەلگرت ولە شوێنی خۆی دانیشتەوە وجارێکی تر بە تووڕەیی گوتی: کەواتە هەرگیز نابیتە پیاو... کوڕم تۆ پیاوی ئاغای... کەس لە تۆ پیاوتر نییە... چۆن شەرم لە مێگەل دەکەیت... ئەم رووتەوپووتانە هەموویان وەك کەر و مانگان... دەبێت بەگۆچان مامەلەیان لە گەڵ بکەیت... تاکو رێزت لێ بگرن، گرنگ نییە تۆیان خۆش بوێت، گرنگ ئەوەیە لێت بترسن... تۆ لە گەڵیان توند و تیژ بە، ئەوساتە خۆت دەبینی چۆن بەرامبەرت، دەستەئەژنۆ سەریان دەچەمێنن... تۆ وادەزانی ئەم ئاژەلآنە منیان خۆش دەوێت؟!... نەخێر عەولا، ئەمانە هەر بە زگ ماکی گیرودەی پیلان و شەڕ و ئاژاوە و ویاخی بوونن، گەر ئەم گۆچانە بەردەوام لە سەر سەریان رانەگرم و جارجار نەیوەشێنم و هێوریان نەکەمەوە، هەر لە خۆیانەوە و بێ رارایی و خۆگرتنەوە ئاشووبەیەکی ئەوتۆ فەوتێنەر دروست دەکەن، کە هەر دواییەکەی خێربێت... ئەم رووت و پێخواسانە، خوا نەکات هیچیان لە دەست بێت، ئەگینا وەك دڕندەکان بە ددانیان دەمان هەنجێنن... ها بگرە، بگرە ئەم خەنجەرە و واز لە شوانی بێنە، تۆ ئێستا گەنجی و لە ئەمڕۆ بەدواوە ئەرکی

گەورەت پێرادەسپێرم... هەر لە ئێستاوە تۆ دەستەڕاستەی منی... لە بەیانییەوە ئەم جل و بەرگانە بگۆڕە، تێکەڵی خەڵکی ئەم دێیە ببەوە... هەر زمانێکی درێژت بینی بیبڕە، هەر چاوێکی بەگومانت بینی دەریبهێنە، هەر کەس لە بەرامبەرتدا هەڵنەستا، قاچەکانی بشکێنە، ئینجا سەیرکە چەند مرۆڤی قسە خۆش و بەڕێزن، چەند بەخشندە و میهرەبانن، چەند خانەدان و رەوشت بەرزن، بۆ دڵخۆشکردنت ئامادەن خۆیان و ژنەکانیان سەمات بۆ بکەن، هەر لە دوورەوە کوڕنووشت بۆ دەبەن... تۆ بەس گوێڕایەڵی رێنماییەکانی ئاغاتبە، ئەم خەڵکە هیچوپووچە هەر هەموویان ملکەچی فەرمانەکانی تۆ دەبن... ئەوسات تەمەنی پازدە شازدە ساڵان دەبوو، قۆناغێکی نوێ لە ژیانی دەستی پێکرد... بەو جۆرە بووە جەللاد و تەرەسی ئاغا... بە درێژایی ئەو شەوە لە خۆشییا نەنووست... ویستی پەڕاوەکانی رابردووی دابخات و پەڕێکی نوێ هەڵداتەوە، بەلاَم نەیتوانی ئەو هەموو سەربردە دڵ تەزێنانە فەرامۆش کات... رەگی ئازارەکان بە جۆرێك لە ناخیدا چەقی بوون، ئەگەر هەڵی بکێشایە ئەوەتا هەموو جەرگ و هەناوی لە گەڵ دەردەهات... بە گیانێکی تۆڵەسەندنەوە، هەر لەو شەوە نەخشە و پیلانەکانی داهاتووی کێشان و کەوتە دالغە و خۆدواندن... خۆ ئاغا راست دەکات... تاکەی قوربانی حەز و ئارەزووەکانی ئەم هەلپەرستانە بێت؟!... ئەوان چییان لە ئەو ماقوولترە؟... کام بەدکاریی ریسوا دەکەن؟... بۆ بەهۆی بەدرەوشتی دایکی سزا بدرێت؟... ئینجا بەس نەبوو ئەو بەسەزمانەش بە توندترین شێوە خۆی لە تاوانەکانی پاککردەوە... ئیتر هەر چۆنێك بێت ئەو گوناهی چییە؟... پاشان کێ بوون ئەوانەی دایکیان بەدڕەوشت کرد و کردیان بە داوێنپیس و ئینجا نەفرەتیشیان لێکرد؟... بەسە ئیتر شەرم و ترس و پەژارەو نیگەرانی... ئیتر ئەو عەولایەی کاتێك لە شەرمی تانەلێدانی کەسانێك خۆی حەشار دەدا، بوو بە عەولایەکی دڵ رەق و چاو قاییم... بۆ جێبەجێکردنی حەزووئارەزووەکانی ئاغا نوقمی ناو دونیای تاوان و دەستدرێژی بوو.

ئێستاش کە لە تەمەنی چل ساڵیدا دەبێت، بەجەستە زەبەلاح و پشت پان و کەللەسەرە گەورەکەی، بە درێژایی ئەو ژیانە نوێیەی هەستی بەوە نەکردووە، کە ئەویش مرۆڤێکە و جیایە لە ئاغا، ئەو هەمیشە پارچەیەك بووە لە ئاغا، بە درێژایی ژیانی بیری لە خۆی نەکردبۆوە، هەموو کاتەکانی بۆ حەوانەوە و دڵخۆشکردن وخزمەتکردنی سەروەرەکەی تەرخان کرابوو، خۆنەویستانە هەموو بەیانییەکان، پێش ئەوەی ئاغا دەنگی بانگی بەرەبەیان ببیستێت، ئەو وشیار دەبۆوە و سۆپا و سەماوەرە دارەکەی دایدەگیرساندنەوە و چاپەستە ئاوێکی گەورەشی دەخستە سەر سۆپاکە و لە گەڵ دەنگی ئاغا هەمان نەریتی بەیانیانی دووبارە دەکردەوە، ئەوەی لە هەمووی سەیرتر بوو، نەك تەنها جارێك، بگرە دەیان جار، ئەو بە نووستوویی و بێ هەڵەکردن ئەو هەموو کارانەی ئەنجام دەدان، بە نووستوویی سۆپا و سەماوەرە دارەکەی دایدەگیرساندنەوە، بە نووستوویی چاپەستە ئاوەکەی دەخستە سەر سۆپاکە و بە نووستوویی ئاوەکەی ئامادە دەکرد و دەیگەیاندەی ناو ئاودەستەکە و لە بەردەرگای ئاودەستەکەش، بە نووستوویی خۆی دەچەماندەوە و فەروەکەی لە سەر ملی هەڵدەگرت، هەر هەمووی بە نووستوویی و تەنها یەکجاریش نەبێت، ئەگینا هەرگیز قادر ئاغا پەی بە بارە نەئاساییەکەی نەکردبوو، هەڵبەت ئەو جارەش خەتای خۆی نەبوو، نەخێر خەتای خۆی نەبوو، بەڵکو خەتای ئاغاژن بوو، کە پاش نیوە شەوێکی درەنگ، بۆ تێرکردنی حەز و ئارەزووەکانی دامانی، ناچار بوو بە دزیەوە پەنا بۆ خولامەکەیان ببات و رووبکاتە دیوەخانەکە، بەڵێ، تەنها ئەو بەیانییە، چونکە ئاغاژن زۆر ماندووی کردبوو، تێرخەو نەببوو، بۆیە بەیانی بە دەم خەوەوە، لە جیاتی ئاوی ناو مەسینەکە شلەتێن بکات، ئەو هەر بە گەرمی دایە دەست ئاغا و نیتر لە گەڵ هات و هاواری ئاغا، لە خەوە قووڵەکەیدا بە ئاگاهاتەوە، رۆژی رەشی بوو ئەو رۆژە، چونکە هەر کە ئاغا پاش قیژاندنەکەی، بێ هەڵدانەوەی شەرواڵی، لە ئاودەستەکە دەرپەڕی، ئەو بەستەزمانەی لە سەر سك درێژکرد و بەرماوەی ئاوە گەرمی ناو چاپەستەکەی رشتە سەر ئاوەندی کونی قنگی.

هەر چۆنێك بێت، ئەو بەیانییەش، هەر كە ئاغـا لـە خـۆی بـۆوە و لـە ئاودەسـتەكە دەركەوت، ئەوەك سەرمای بێت، خێرا فەروەكەی خستەوە سەر ملی، هەر لە سەر ئەو بەرماڵەی لە ناوەندی دیوەخانەكە و تاكو ساردی نەبێت هەر لە تەنیشت سۆپاكە بۆی راخستبوو، لە سەرخۆ دەستشۆرە ئاڵتوونیەكەی لە بەر دەمی دانـا و مەسینەكەی بـۆ گرت، هەر كە دەست نوێژی خۆی گرتەوە، خاولیەكەی دایە دەستی و بەخێرایی و پـێش ئەوەی نوێژە كورتەكەی تەواو بكات، هەندێك پشكۆی تری ناو سۆپاكە گواستەوە نـاو سەماوەرەكە و ئاگرەكەی گەشاندەوە و كاكڵە گوێز و هەنگوینەكەی بۆ ئامـادە كـرد... ویستی هەموو كارەكان پێش لە خۆبوونەوەی تەواو بكات، بەڵام وادیار بـوو نوێژەكـەی ئاغا لە تەقەلاكانی ئەو خێراتر بوو:

- سەگە كوا چایەكە؟
- قوربان هەر ئێستا ئامادە دەبێ... ئەم جارە نوێژەكە خێراتر كرا؟!
- هەتیوو، نوێژی بەیانی هەر بۆ خۆی كورتەو دوو سەرنوقلاتە.
- بەلێ گەورەم هەر لە كوڵكردنەوەیە.
- لەكوڵكردنەوەی چی هەی تەرەس باب... دەتەوێ لە گـەڵ بەرەبەیانـدا تووشـی بێ باوەڕیمان بكەیت؟
- حاشا گەورەم... بەڵام خوا هەڵناگرێ ئەم سوعبەتەش درێژەی خایاند.
- چایەكەمان بۆ بێنە و دەمت داخە... زۆر گوتن قورئان خۆشە.
- بەسەری ئاغام زۆر قورئانیش ناخۆشە.

لە گەڵ ئەم قسەیە ئاغا یەكسەر دای لە قاقای پێكەنین و ئینجا لە سەرخۆ:

- ئەگبەت ئاگادار بە... ئەم قسانە بەرەو مەرگمان دەبات.
- بۆ دیارە من خولامی ئەم ئاغایە نیم؟... مەگەر بـۆ دڵخۆشـكردنی تـۆ نـەبێ ئەگینا لای ئەو مەڕ و بزنانە هەر سوێند بەنوێژەكانی تۆ دەخۆم.

- دەزانم عــەولا دەزانم....تــۆ پیــاوی پیــاو... بــەلام ئــەم ئایینــەش جێگــای سەرسووڕمانە و کەس سەری لێ دەرناچێ... خۆ منیش زۆر بڕوام پێی نییە، بەلام ئەوەك ڕاست دەرچێت و دوایی........ پاشان نەتبیستووە ئەم گەلە مێگەلەیە، کاتێك دەڵـێن: ئەوەی نووێژ نەکات وەك سەگ گلاوە !!

هیچ شتێك بە قەد وشەی (تۆ پیاوی)، دەمارەکانی عــەولای زلنــەدەکرد، وەك بڵـێن بەردەوام گومانی لە پیاوەتی خۆی هــەبێت، دەبوایــە ڕۆژ ێ جارێــك، یــانیش بەلایــەنی کەمەوە هەر هەفتەی جارێك، ئاغا بەو ئازناوە زرنگەدارە پیــای هەڵـدابا، ئــەگینا وەك ئالودەبووەکان، تاکو هەست و هۆشە ئالۆزەکانی پێ ئارامکاتەوە، لە ســەرەتا ماوەیــەك بە خەمۆکی گوێچکەکانی شل دەکرد و بە ڕواڵەتی پاڕانەوە چاوانی دەبڕیە دەمی ئاغا و چاوەڕێی درکاندنی ئەو وشــە تەلیــسماوییەی دەکــرد، بــەلام هــەر کــە لــە ڕادەی خــۆی تێدەپــەڕی، جڵــەوی هۆشــی بــەردەبوو، وەك ئەژدەهایــەکی ورووژێنــراو، گڕکــانی ڕق و کینەکانی ناخی بــە ئەنجامــدانی تــاوانێکی دڕندانــە دادەمرکانــدەوە، خــۆ هــەر چــەندە خانەدانێکی وەك ئاغــاش، ئەوەنــدە ڕەزیــل نــەبوو، ، نــەخاسما بەرامبــەر کەســێك کــە ئامادەبوو بە جوولانەوەی ســەری پەنجەیــەکی، لاشــەی ئــەولیاکانی بــۆ لــە گۆڕەکانیــان دەربهێنێت و ئێسقانەکانیان وردوخاشکات، تا جاروبار ئەو پیاوەتییەی لە گەڵدا بکات و لەو قسەخۆشەی بێبەش نــەکات... عــەولا هــەر کــە پیالــە چایەکەی لــە پــێش دانــا، بەڕووخۆشی بەرامبەری وەستا و:

- قوربان بە سەری تۆ... خوا هەردوو چاوانم کوێرکات ئەگەر ئەم سوێندە بە درۆ بخۆم... شان و شەوکەتی جەنابتان ترسێکی ئەوتۆی خستوتە دڵی ئەم خەڵکە، لە مــاڵی خۆیانیش ناوێرن بە خراپی باستان بکەن... دوێنێ کە لە سەر ڕاسپاردەی جــەنابتان، لــە ناو دەوەنە دڕکاویەکەی نزیك کانی ژنان خۆم دانووساندبوو، گوێی خۆم ســووك کردبــوو، پاش قسەی هەڵەق ومەلەقی ژنان، یەکێکیان بە واقی وڕمــاو پرســیاری ئــەوەی دەکــرد: ئایە ئاغاش وەك ئەم هەموو خەڵکە دەچێتە سەر ئاو؟!

له گەڵ بەردانی پێکەنینێکی تری شێتانە و بە تڕوفیزتر، ئەم جارە،شێوەگەلی رشانەوە، قومە چایە و لەتکە دیشلەمەکەی ناو دەمی ئاغا دەرپەڕین، چەند جارێك بە سەختی کۆکی، رەنگی بەرەو زەردی هەڵگەڕا، خەریك بوو هەناسەکانی بپچڕێن، بە ئەستەم توانی ئەو جامە ناوە فڕبکات، کە عەولا بە چاوترووکانێك خستیە ناو دەستی، هێدی هێدی هەناسەکانی هاتنەوە بەر و:

- خوابتگرێت لە گەڵ گاڵتەکانت... ها بگرە ئەم قاپانە هەڵگرە و دیشلەمەیێکی ترمان بۆ تێکە و جگارەیکمان بۆ بێنە.

- بوەستە با هەر لەو تووتنە بۆنخۆشەی دوێنێ لە کوێستانەوە بۆیان ناردبووی جگارەیەکی ئەنتیکەت بۆ داگرم.

قادر ئاغا تاقە میراتگری بنەماڵەکەی بوو، بە بەژن و بالا لە عەولا دەچوو، یان راستر ئەوەیە بڵێین ئەوەی عەولا لە ئەو دەچوو، بەلام روخساری زۆر سپی و سۆرتر بوو، لە راستیدا ئەو جاران برایەکی لە خۆی گەورەتری هەبوو، بەلام بە پێی ئەو هەواڵەی کە باووباپیران بە ترس و لەرزەوە دەیانچرپاندە گوێچکەی رۆڵەکانیان، گوایە قادر ئاغا چاوی لە دەستگیرانەکەی ئەو برایەی بووە، بۆیە جارێکیان لە کاتی راوکردن ئەو هەلەی بۆ رەخساوە ولە ناوی بردووە، ئیدی هەم ئاغایەتییەکەی باوکیی بۆ مایەوە و هەم دەستگیرانی براکەی، ئەو هەر لە منداڵییەوە لە لایەن باوکییەوە، زۆر بەنازێکی لە رادەبەدەر بە خێو و پەروەردەکرابوو، گوایە کاتێك لە گەڵ قوتابیانی قۆناغی سێی سەرەتایی، کە سەرجەم ژمارەیان چوار قوتابی بوون، تەنها ئەو لە تاقیکردنەوەکانی سەری ساڵ دەرنەچوو، بەلام کەس و کاری قوتابیە سەرکەوتووەکان... جگە لە باوکی حاجی هەمزە... ئینجا چ لە ترسی ئاغا یان وەك رێزگرتنێك، نەیانهێشت ساڵی پاشتر منداڵەکانیان سەرکەونە قۆناغی چوارەم و ئاغای بچکۆلانە و جێ نشینی ئایندەیان لە دوای خۆیان بە جێبێڵن، ئیتر ئەوانیش ساڵی پاشتر هەر لە هەمان قۆناغدا مانەوە، لە سەر قسەی حاجی هەمزە، کە ناچاربوو بە هۆی نەبوونی قۆناغی چوارەم، لە لایەن

باوکییەوە ڕەوانەی قوتابخانەی گوندێکی تر بکرێت، هەمیشە دەیگوت: ئەم لووت بەرزی و خۆ بە زلزانینەی ئەم ئاغایەمان سەرئەنجامێکی لۆژیکیی شێوەی پەروەردەکردنەکەی بوو، بۆیە دەڵێن کەسانێك هەن گەورەن، چونکە خەڵکانێکی بچووك لە دەوریان خولاونەتەوە و کڕنووشی ترسی بۆ دەبەن.

هەر چۆنێك بێت، عەولا چایە تاڵەکەی بۆ دانا، هەر لە بەرامبەری، کەمێك لە دوورەوەی لە سەر ئەژنۆکانی دانیشت و لە گەڵ پێچانی جگارەکە و بۆ زیاتر دڵخۆشکردنی، بە گەرمی:

- ئەمجارەیان گەنم ڕەنگێکی باریکەلەم بۆ دەستنیشان کردوون.

ئاغا بە لووسینەوەی لێوەکانی، سەری خۆی لەقاند و سمێڵە بۆرەکانی بادا، لەگەڵ فڕکردنی دیشلەمەکە، بە ڕووگەشیەوە ڕووی کردەوە خولامەکەی و برۆکانی ڕاتەکاند، لە سەر خۆ و بە تامەزرۆیی:

- زۆر حەزم لەو ڕەنگەیە !

- قوربان مرۆڤ بە سروشتی خۆی حەزی لە گۆڕینە.

- ئەگەر خوا ئەم وەزعەمان هەروا بۆ ڕاگرێت، ئێمەش بە پێی ئارەزووەکانمان، ڕەنگەکان دەگۆڕین.

ئەمەی گوت و ماوەیەك بێدەنگ بوو، لە پڕێکا نوقمی ناو خۆدواندن و بیرکردنەوەیەکی قووڵ بۆوە، ترسێکی نادیار ڕووخساری داگرت، پاشان بە ڕواڵەتێك کە ڕاستیی و بایەخدانی پێوە دیاربوو:

- ئەی مامۆستاکە چی لێ هات؟

- ئەو هیچ وپوچە هێشتا هەر خەریکی ڕێکخستنی قوتابخانەکەیە، وەك قەرج ماڵ ماڵ دەگەڕێت و ناوی منداڵەکان تۆمار دەکات، هەندێك خەڵکیش لە بەر خاتری حاجی هەمزە بەگەرمی پێشوازیی لێی دەکەن.

- دەبێ ڕێگا چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە؟

- ئاغام ئێوە بەس ڕێگا بدەن، پارچە پارچەی دەکەم.

- نا، هەتیوو وریابە، ئەمە پیاوی میرییــە، دەسـتتێوەردانی ئـەم مەسـەلەیە، کارێکی وا ئاسان نییە.

جارێکی تر کەوتەوە دالغە و بیرکردنەوە، بە چەواشەیی ماوەیەك بە هەنـدێ قـسەی نەناشنا خۆی دوواند وپاشان بێ سەربەرزکردنەوە:

- پاشان ئەو سەگبابەشمان بۆ بانگکە.

- مامۆستاکە؟

- نانا... عزەت... با ئەم شەو بێتە ئێرە و...... نا نا... نامەوێت ڕەزای قورسی ئەو کافرە ببینم... کچی خۆی بێ ڕەزامەندی ئێمە داوەتە شوو... بڕۆ ماڵیـان و قـاتێ ڕەزالـەتی لەبەرکـە و نیـوەی ئەختەکەیـشی لێ بـسێنە، ئەگـەر نـا بـە گـۆڕی بـاوکم لاشەکەیشی نیوە دەکەم.

- لە جێی خۆیەتی، چونکە ئەمڕۆ هەر نۆرەی ئەویـشە تـا چـەند بـارەدارێکی بەڕووشمان بۆ بێنێت.

- لە گەڕانەوەش، ئەسرین بۆ هەمان شوێن...... تێبگە؟...

- خەمت نەبێ، ئەمەیان من شارەزاترم، ئەمجارەیان لە سەر قسەی خانمی بـچووك بانگی دەکەم.

- ئافــەرین عــەولا ئافــەرین... هـا هـا هـا... زۆر بـیری دەکـەم، ئـەمڕۆش دەرفەتە،خانمی گەورە بۆشار سەفەر دەکات و........

عەولا جگارەکـەی پێـشکەشکرد و هـەر بـە پەلگرەکـەش پارچـە پـشکۆیەکی نـاو سۆپاکەی بۆ نزیککردەوە، ئەویش لە گەڵ داگیرساندنی جگارەکە و هەڵکێشانی یەك دوو مژی درێژ، بە سەر لەقاندن، بۆچوونی لـە مـەڕ تووتنـە نوێکـە دەربـڕی و درێـژەی بـە قسەکانی دایەوە:

- ....... پاشان ئەو سەگبابەش لغاوکە... عەزەی کوڕی خورشید... با بزانین چۆن بێ ئاگاداری ئێمە هات وچۆی شار دەکات؟... دیارە بەرەڵایە ؟!

عەولا، بۆ جێبەجێکردنی فەرمان و راسپاردەکان... هەر کە لە گەڵ دەستی خۆی قەفەسی کەوەکانی گواستەوە ناو باخچەکە و دان و ئاوەکانیانی بۆ نوێکردەوە، بەگەرمی بەرەو ناو دێیەکە نشێوبۆوە، یەك لە دوای یەك بەرەو شوێنە دەستنیشانکراوەکان هەنگاوی نا... ئاغاش هەر کە ئاغاژن و خولامەکانی بەرەو شار لە ئاواییەکە ئاودیووبوون، ئەو لە سەر هەمان نەریتی رۆژانەی، جارێکیتر بەرەو ناو باخچە پان و بەرینەکەی شۆڕبۆوە، چەند تاڵە پوونگێکی لێکردنەوە و بەرامبەر قەفەسەکان لە سەر جۆلانەکەی بەر هەتاو دانیشت، لەگەڵ قاسپە قاسپی کەوان، سمێڵە بۆڕەکانی با دەدان و چەپکە پوونگەکەی بۆن دەکرد، بە تامەزرۆیی چاوەڕوانی گەڕانەوەی خولامەکەی دەکرد... هەر کە عەولاش گەڕایەوە، بە لەخۆبایی، نیمچە کوڕنووشێکی بۆ برد و کەللەی سەری بۆ لەقاند... ئەویش دەستبەجێ بەگەرمی بەرەو ژووری ژووانەکە ئاودیوو بۆوە ولە گەڵ دەستی خۆی دەرگاکەی داخستەوە.

عەولا وەك قەبە نێرییەك کە کاتی پەڕینی هاتبێت، لەناو دەریای حەزە ئالووشاویەکانی خۆیدا نوقم بۆوە... بەتامەزرۆیی چاوەڕێی بەرماوەی ئاغاکەی دەکرد، بەوردی چاودێری دەوروبەری شوێنەکەی دەکرد، ئەو جارەیان ژووانەکە زۆری خایاند، بە هاروهاجی ئەم سەر و ئەو سەری باغەکەی دەکرد، ئەوەك شتێکیان بە سەرهاتبێت، یان ئاغا لە خۆی چووبێت، چەندین جار لە پاش دەرگا و پەنجەرەکە نووسایەوە و گوێچکەکانی شلکردنەوە، چرپە چرپەکانیان زیاتر تینی دامانی دەورووژاند، خەریك بوو هەر بە خەیاڵاتەوە خۆی تەڕکات، خێرا بەرەو ناو ئاودەستەکە بازیدا و بە ئاوی سارد، کەمێك دامانی فێنککردەوە... بە کەللەگەرمی، وەك سەرخۆشێك، بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات، هەر لە سەر جۆلانەکەی ئاغا داهاتەوە و چاوەکانی بریە دەرگاکەوە و کەوتەوە بیرکردنەوە و لێکدانەوە... ئەم کافرە یان دەیەوێت ئاگری چەندین رۆژ بە یەك

ژووان دامرکێنێتەوە، یانیش پیری هیچی بۆ نەهێشتووە... ئەو بڕوای بە قسەکانی ئاغـا نەدەکرد، کاتێك نوقمی ناو ئەو جۆرە باسەی پـڕ جـۆش و خرۆشـانە دەبـوون، کـە بـە سووکی پێی دەگوت: گوێدرێژ ئێوەی مێگەڵ نازانن چۆن چێژ لەم کـارە وەرگـرن، ئێـوە وەك نێری زوو زوو لە کۆڵ خۆتانی دەکەنەوە... ئیتر ئەو وای بۆ دەچوو، کـە ئاغـا بـەو بەهانەیـە بێتاقـەتیی خـۆی دەشـارێتەوە، ئـەگینا کـێ بەرگـەی ئـەوە دەگرێـت، لـەو شەڕوهەڵایەدا سـستی بنوێنێـت... لـەو جـۆرە لێکدانەوەیـەدا بـوو، کاتێـك ئاغـا بـە ڕواڵەتێکی شلەژاو و بێ سـەروبەر هاتـەدەر، ئـەوەك چـاوی پێبکـەوێت، کـە لـە سـەر جۆلانەکە دانیشتووە و قوریکات بە سەریا، چونکە نەك هەر خولامەکانی ئاغا، بگرە بۆ هیچ کەسێکی لادێی نەبوو، پێ لە مەرگی خۆی بنێت و بەرامبەر ئاغا لە سەر جۆلانـە دانیشێت، بگرە کەسێك نەبوو لە ماڵی خۆیشی بوێرێت کەر لـە بـاوکی خـۆی بـدات و کورسی بە کاربهێنێت، ئەی ئەوە نەبوو پێش دوو ساڵ یەکێکیان تاخمە کورسیەکی کڕی، کەچی هەر هەمان ڕۆژ لەنیوەی شەودا لـەناو ئـەو ئـاگرەی لـە خانووکـەیان بـەرپابوو، کورسییەکان توانەوە... ئیتر عەولا بە چاوترووکانێك ئەو شوێنە تایبەتییەی جێهێـشت لە سەر پێیانی و دووری جۆلانەکە چەقی، بە ڕووخۆشیەوە بەرەو پیری چوو و:

- گەورەم، دەك نۆشی گیانتان بێ.

ئاغا هەر بەرێوە، چەند جارێك بۆ ڕاست و چەپ خۆی تەکاند و قـرەی لـە نێـسقانی پەنجەکانی دەستی وبربڕەی پشتی هێنا، بە بێتاقەتی لەسـەر جۆلانەکـە دانیـشتەوە، بـە هەردوو دەست سەروسیماکەی خۆی ڕێـك خـستەوە، سمێڵـە بۆرەکـەی شـانە کـرد و بـە ڕووخسارێکی خەمۆکی سەیرێکی عەولای کرد و بە دوودڵی:

- عەولا وەك جاران نەماوم، وادیارە پیر بووم؟

عەولا کە یەکەم جاری بو ئەم جۆرە دانپیانانە ترسـناکەی ببیـستێت، لـە ترسـی هەڵچوونی، ئەوەك کوێرانە قسەیەك بکـات و کارەکـە ئالۆزتربکـات، بـە ڕوخـسارێکی دڵتەنگ و خەمۆکییەوە، ماوەیەك بێدەنگ بەرامبەری ڕاوەستا و هیچ قسەیەکی نەکرد،

پاشــان خێــرا بــەرەو دیوەخانەکــە ڕۆیــشت و زۆری نەخایانــد لــە گــەڵ جامێــك ئــاو و پیاڵەچایەکی شرین گەڕایەوە و لە گەڵ تێکدانی چایەکە بە گەشبینی ســەیرێکی ئاغــای کرد و:

- قوربان ئاحەزانت پــیر بــن... تــۆ هێــشتا گــەنجی... بــەڵام سووچــی ئاغامــە، جەندجارم پێگوتی، بەردەوام بە لە راوکردن، تۆ هەمیشە لە ماڵەوە دانیشتووی و خۆت نابزوێنی، ئاخر ئەمە باش نییە بۆ تەندروستیت.

- ها... تۆ بڵێی؟!... کەواتە خێراکــە، کەرەســتەکانی راومــان بــۆ ئامادەکــە و تاژیەکان رستکە و ماینــە کەوێتییەکــەش زیــن کــە و قرمــە مەنجــستیەکەش لــە بــیر مەکەی، وەسمان و کەریمیش ئاگادارکەوە.

- باشە قوربان هــەر ئێــستا، وابــزانم ئــەمڕۆ هەنــدێ هــەنگوینی نایابترێــشمان دەستدەکەوێت.

هەرکە ئاغا و دارودەستەکەی لە کۆشك و تەلارەکە شۆڕبوونەوە، پــێش ئــەوەی لــە ئاواییەکە دەربچن و بەرەو بناری چیاکە بکەونەڕێ، عەولای پەرۆش، بە سێ بازی خــۆی گەیاندە سەر بەرماوەکــە و بەتامــەزرۆیی پــەلاماری بەســتەزمانەکەی دا و بەهەڕەشــە خستیەوە ژێر دامانە داگیرساوەکەی و گەوزاندیەوە.

-٢-

به درێـژایی دوێنـێ شـەو خـەوی لێنەکـەوتبوو، بەرامبـەر سـۆپادارەکە، لـە دیـار لاپەڕەکانی ڕەشنووسی ڕۆمانەکەی چوارمشقی دانیشتبوو، ماوە ماوە پاش خواردنـەوەی چایەکی تر، جگارەیەکی تری دادەگیرساندەوە و هەندێك لەو بەشەی هەموار دەکـردەوە کە تێیدا دیمەنی کۆچك و دیوەخانی ئاغای دارشتبوو، ئەو هەرچەندە جاران لەو کـەش و هەوایەدا نەژیابوو، بەڵام بە پاڵپشتی مام مەجید، کە جاران بەردەوام لە گەڵ بەرپرسانی میری لەو شوێنانە میوان دەبوون، زانیاریەکی باشی پەیـداکردبوو،تا رادەیـەکی گونجـاو توانیبووی تیشك بخاتە سەر گرنگترین و ترسناکترین مەڵبەندەکانی فەرمانڕەوایی کە ئەو جۆرە کۆمەڵگایانە بەڕێوەدەبەن. ئیتر تا بەرەبەیانێکی درەنگ هەر سـەرقاڵی نووسـینی خاڵە سەرنجراکێشە نوێکان و سڕینەوەی کۆنە وشە و رستە بێبایەخەکانی بوو، بە هـەر حاڵ، ئەمەیان یەکەم شەوی بێ خەویی نەبوو، ئـەو لـە مێـژە لـە گـەڵ بێـداری شـەوان راهاتبوو، ئەو زۆربەی شەوان تا بەیانی هەر خەریکی نووسینەوەی ئەو ڕۆمانە تراژیدیایە دەبوو کە بە سەرەتایەکی زۆر ئاڵۆز دەسـتپێکرابوو و ئـیتر کۆتاییەکـەی لێ ببـوە گـرێ کوێرە، سەرەڕای ئەوەش زۆر جـار لـە کانگـای ناخیـەوەی حـەزی لـە کۆتـایی هێنـانی نەدەکرد، بە بۆچۆن و تێڕوانین و لێکدانەوەی ئـەو، ئـەو کۆتـایی هێنانـە، کۆتـایی بـەو جیهانە خەمدارە دەهێنێت کە ئەو بە درێژایی ژیانی تیایـدا ژیـاوە و جگـە لـە خـەم و خەفت، ئەو هۆگری هیچ کەش و هەوایەکی تر نەبووە و دڵی پـێ نەکراوەتـەوە، ئـەو بـە درێژایی ژیانی بەشداری زەماوەندێك یان هەر جـۆرە ئـاهەنگێکی دڵکـەرەوەی نـەکردوە، زۆرجار هەژاری هاوەڵی پێی دەگوت: تۆ ناتوانی ئەم ڕۆمانە بەم شـێوەیە تـەواو کـەیت، ئاخر تۆ خۆت لە ناو ڕۆمانەکەدا دەژیت، تۆ لە کاتی نووسینەوە بە جۆرێك نـوقمی نـاو بەسەرهاتەکان دەبیت کە یەکجاری پیـشەی نوسـەریت لـە دەسـتدەدەیت، تـا رادەیـەك دەبیتە کەسێکی ناو ڕۆمانەکە ئیدی خودی خۆت وەك ڕۆماننووسـەکە دەکوژیـت، ئـیتر

تاكو رۆمانەكە بە شێوازێكی تەندورست و بێخەوش تەواو كەیت، دەبێت خۆت لە ناو جیهانەكە دەرخەیت و لە گەڵ هەموو پێكهاتە و كەسایەتیەكانی ناو رۆمانەكە، بە یەیەك چاو و بە یەك تەرازوو مامەڵە بكەیت... ئەویش بە دودڵی دەیگوت: هەر چۆنێك بێت، منیش هەر بەو تاقە رۆمانەم دەژیم، هەر كە لێی بوومەوە شەوخونیم لە دەستدەدەم و دەكەومەوە ناو رەشەخەونەكانم!!

خۆ لە راستیدا، هەموویان دەیانزانی، كە جوتیار تا رادەیەك ناحەقی نەبوو خۆی بە ئاسانی بداتە دەست خەو، ئەو هەر كە پێلووی چاوانی دەنووقان، دەست بەجێ خۆی لە ناو جیهانە دڵتۆقێنەرەكەی دەبینیەوە... هەر پێرێ شەو جارێكی تر، هەمان خەون و هەمان كارەسات رایدەچڵەكێنێتەوە، لە گەڵ قیژە و هاوارێكی دڵتۆقێنەر بە ئاگادێتەوە، تا بۆ ماوەیەكی كاتی، ماڵ ئاوایی لەو جیهانە ترسناكە بكات و خۆی لە ئامێزە گەرمەكەی پلە ئایش ببینێتەوە، كە دەستبەجێ لەگەڵ دەنگی قیژاندنەكە، لە گەڵ مام مەجیدی هاوسەری لە سەر پێخەفەكەیان راپەڕین و لە دیار سەری وەستان، جوتیار بە داماوی:

- دیسان هەمان رەشەخەون!!

ئایش یان هەر وەك چۆن دراوسێ و هاوەڵانی جوتیار بە پلە ئایش بانگیان دەكرد، ئەو كاتە تەمەنی پەنجا ساڵ دەبوو، ئافرەتێكی قەڵەو و سپیكەلە بوو، چونكە نەزۆك بوو، بە رواڵەت لە كچێكی سی چل ساڵی دەچوو، تا ئەو دەمەش دڵڕفێنی و مێیەتی خۆی لە دەست نەدابوو، بە پێچەوانەوەی مەجیدی هاوسەری، كە بە مام مەجیدی پۆلیس ناوی دەركردبوو، بەڵام پلە ئایش زۆر جار لە كاتی تەنگاوە بە پیرە ورچ ناوی دەبرد، لە تەمەنی شەستەكان بوو، كابرایەكی درێژ و رەشتاڵە بوو، زۆرجار كە بە مشت و مڕی بەرووی یەكدیدا دەچوون، جوتیار و هەژاری هاوەڵی بۆ ئاژاوەنانەوە و ورووژاندنی پلە ئایش، پێیان دەگوت: باشە تۆ لەم تەمەنەش لە چوارده ساڵییەك جوانتری !!... ئاخۆ لە تەمەنی گەنجیت چ پەریزادەیەك بوویت؟... سەیرە چۆن بەم پیرە پۆلیسە قایل

بوويت و شووت پێکرد؟!... ئەویش بە لە خۆبایی دەیگوت: ئەی پێم نەگوتن فێڵیان لێ کردم ، کە هاتنە خوازبێنیم، لە جیاتی ئەم نێسك قوڕسە، گەنجێکی تری زۆر قۆزیان بۆ یەکتربینینمان ناردبوو.

لە ڕاستیدا، پلە ئایش و مام مەجید بۆ یەك ڕۆژیش، بەرگەی لێکدابڕانیان نەدەگرت، مام مەجید زۆر قسە خۆش و قسەزان بوو، هەرگیز بێ دڵی ژنەکەی نەدەکرد، تەنها بە یەك قسە تووڕە دەبوو، کاتێك ئایش داوای لێ دەکرد تاکو وجاغ کوێر نەبێت، ژنی تر بۆ خۆی بێنێت، ئەو تەنها لە بەرخاتری ئەو، لە کاتی خۆی قایل بوو، هەتیوێکی لادێیی بێ دایك و باوك بەخێوبکەن، ئیتر هەردووکیان زۆر یەکدییان خۆش دەویست، بەڵام لە خۆشیان زیاتر، جوتیاریان خۆشتر دەویست و هەر لە بەر خاتری ئەویش بوو، کە شاریان جێهێشت و دەمێکە لەو دێیە نامۆیە نیشتەجێن.

زۆر لە مێژان لە گەڵ ئەو قیژە و هاوارە دڵتۆقێنەرەی جوتیار، کە ماوە ماوە لە کاتی خەوتندا هەڵیدەدا ڕاهاتبوون، کاتی خۆی نەك هەر پزیشکانی پسپۆر، بەڵکو شێخ و مەلاکانی دوور و نزیکیانیش نەهێشتبوو، کە پەنایان بۆ نەبردبێت، تا چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە، بگرە جارێکیان لە سەر ڕاوێژکاری ئافرەتێکی دراوسێیان، گوایە نوشتەی قەشەکان بۆ ئەو جۆرە نەخۆشییە لەوەی مەلاکان کاریگەرترە، سەردانی کەنیسەشیان کرد، بەڵام لەوێش هیچ ڕێگا چارەیەك نەدۆزرایەوە، سەرەڕای ئەمەش، جوتیار بۆ لە دڵدانەوەی خۆی، ماوە ماوە بۆ فاڵگرتنەوە، بەری دەستی بۆ سارای پیرەژنە فاڵچییەکەی دراوسێی هەژاری هاوەڵی دەکردەوە، تا ئەویش بۆ دەستگرتنەوە وخوێندنەوەی چارەنووسی، پاش چاو پیاخشاندن و لێکدانەوەی هێڵەکانی لەپی بە مەندەهۆشی: من قسەی هەلەق و بەلەق ناکەم، من دڵنیام، سوێندت بۆ دەخۆم، هەر بەم زووانە هەموو ئارەزووەکانت بەدی دێن!!

ئەوجارەشیان وەك هەموو جارێك، بەڵام بۆ یەکەمجار لەو گوندە، کە ماوەیەکە بۆی گوازراونەتەوە، پلە ئایش سەرە هێلاکەکەی جوتیاری بە توندی لە ئامێزە گەرمەکەی

گرت، بە پارچە پەڕۆیەکی تەڕ لە بەر ڕۆشنایی چراکە، ئارەقەی ناوچەوانی بۆ سڕیەوە و:
تۆش بەتەما بووی بەتەنیا سەفەری ئێرە بکەیت !!... نا نا، دایە من زۆر باشم، ئەوەتا چەند ڕۆژە لەم گوندەین، ئەمەیان یەکەم جارمە لێرە ئەو خەونە ببینمەوە، ئەم جارەش زۆر ئازاری نەدام... ئەمەی گوت و چرپاکەی جێهێشت، بەرامبەر تاقە پەنجەرە بچکۆلانەی ژوورەکە چوارمشقی دانیشت، لە بەر ڕۆشنایی تریفەی مانگە شەو، بە خەمۆکی سەیری خانووە بێ سەر و بەرەکانی گوندەکەی کرد، جگە لە کۆشک و تەلاری ئاغا، کە لە سەر بەرزاییە پانەکەی سەرووی گوندەکە، زۆر بە قورس و سەنگینی لە ناوەندی ڕەز و باغە پڕەکاندا قیتکرابۆوە، ئەگینا ئەوانی تر هەر هەموویان بە کاریتە و خشتەکی خۆڵ زۆر بە سادەیی ئاواکرابوون... سەیرێکی چوارگۆشەی ژوورەکەیانی کرد و ئاوڕێکی لە مام مەجید دایەوە، کە خەریکی داگرتن و داگیرساندنی سۆپادارەکە بوو، بەبزەیەکەوە: خانووکانیش هەر لە پشتیر و تەویلەکان دەچن !!... خەڵکی دێهات بەردەوام ماڵیان لە سەر پشتی گوێ درێژە و لە ترسی ئاغا ناوێرن خانووکانیان بە ڕێك و پێکی بنیات بنێن... بەڵام ئەم حەوشەی ئێمە باشترە !!... مەسەلەی ئەم حەوشە دوورو درێژە ! مام مەجید، کە ئەو کاتە بەرامبەر سۆپاکە، سەری خۆی بۆ لایەك چەماندبۆوەو خەریکی جۆشدانی ئاگرەکە بوو، بێ سەربەرزکردنەوە ئەو قسانەی کرد و لە خۆشکردنی ئاگرەکە بەردەوام بۆوە، هەر کە بێدەنگیەکەی درێژەی خایاند و نهێنی مەسەلەکەی ئاشکرا نەکرد، جوتیار ناچار بوو جارێکیتر ڕووی بۆ دەرەوە وەرگێڕایەوە و کەوتەوە بێدەنگی و بیرکردنەوە... بیری لە قسەکانی بەڕێوەبەری پەروەردە هاتەوە، کە پێش چەند ڕۆژێك لە پاش مێزەکەی، هەرکە ناوەڕۆکی داوانامەکەی خوێندەوە، دەستبەجێ کورسییەکەی جێهێشت، بە سەرسامی لێی نزیك بۆوە، بە دەستێك داواکەی گرت و بە دەستەکەی تریشی کەللەی سەری دەشێلا، بە وردی چاوێکی تری بە داوانامەکە خشاندەوە، ئینجا بە نیگەرانیەوە، ڕووی تێکردەوە و گوتی: بەڵام تۆ مامۆستایەکی لێهاتووی، وا باشە هەر لە سەنتەری شار بمێنیەوە... هەر کە جوتیار بێدەنگیی نواند،

وەك پاڕانەوەیەك بەردەوام بوو: بەڵام ئەم قوتابخانەیە، دەکەوێتە ناوچەیەك، مەگەر بە کەروبار بتوانیت هاتووچووی بکەیت؟!...لە وانەیە بەڕێوەبەر، بە ڕەوانبێژی ئەو قسەیەی کردبێت و مەبەستی ئەوە بێت، کە ڕێگاکەی سەختە، چونکە لەهەندێ شوێن جادەکە وەك مارێکی زەبەلاح خۆی لە ئامێزی چیاکان دەئاڵاند، لە هەندێ پارچەش، بەهۆی تاشەبەرد و هەوراز و نشێوی ناوچە شاخاوییەکە، ڕێگاکە تەسك و سەختتر دەبوو ، ئەگەر نا، جوتیار شارەزابوو، کە ئەو گوندە جادەیەکی خۆڵی هەیە، چونکە مەلا ساڵحی هاوەڵی مام مەجید نیشتەجێی هەمان شوێن بوو و هەموو سەرەمانگانێك بۆ وەرگرتنی مانگانەی هاتوچووی شاری دەکرد، زۆرجاریش مام مەجید بە جێبە شینەکەی دەیگەیاندەوە دێیەکە... ئیتر هەر کە جوتیار وەڵامی نەداوە، بەڕێوەبەر ناچار بوو بگەڕێتەوە شوێنی خۆی و بە دوودڵی داوانامەکەی ئیمزاکرد و گوتی: ئارەزوویەکی سەیرە، هیوادارم پەشیمان نەبیتەوە !!... هەر کە جوتیاریش گوتی: کەی دەتوانم دەستبەکاربم؟... ئەو بە نیمچە تووڕەییەکەوە: پەلە مەکە، با جارێ ڕێ و جێیەك بۆ نیشتەجێ بوونتان دابین بکەیت، پاشان ئەم قوتابخانەیە زۆر لە مێژە داخراوە، لەوانەیە ئێستا هەر کاول کرابێ، هەر چۆنێك، دەتوانی لە هەفتەی داهاتوو بەلیستێك پێداویستیەکانمان بۆ بەرزکەیتەوە... ئەو بەهێمنی بەرەو دەرگاکە گەڕایەوە، پێش گەیشتن، لەگەڵ دەنگی بەڕێوەبەر لە شوێن خۆی چەقی و ئاوڕی دایەوە، بە بێدەنگی رووی تێکردەوە تاکو قسەکانی تەواوبکات: وریابە، لەو دێیە کەسانێك هەن، پێشوازی لە کردنەوەی قوتابخانەکەیان ناکەن !!...پاش ماوەیەك بێ دەنگی، جارێکی تر بە سەرلەقاندن مۆڵەتی چوونەدەرەوەی وەرگرتەوە، بە هێواشی دەرگاکەی کردەوە و دەرکەوت... بە پیاسە و بێ ئاوڕدانەوە بەرەو بازار ملی نا و تا نەگەیشتە پەرتووکخانەکەی هەژاری هاوەڵی نەوەستا... هەر کە گەیشتیش،لە سەر هەمان نەریتی جارانی، بێ سلاوکردن چاوێکی بە کتێبە کۆنەکاندا خشاندەوە و لە گەڵ دەستی خۆی

یەکێکیانی هەڵبژارد، لەسەر تەختەدارەکەی گۆشەی سەرووی دوکانەکە دانیشت و سەرقاڵی هەڵدانەوەی لاپەڕەکان بۆوە.

هەژاریش پاش دەمەقاڵەیەکی سەخت، تاقە کڕیارەکەی ئەو ڕۆژەی بەڕێ کرد، کە ماوەیەکی زۆر بوو لە سەر نرخی کتێبێکی کۆن مشت و مڕیان بوو، هەڵبەت لە ئەنجامیشدا کڕیارەکە بە دەست بەتاڵی دوکانەکەی جێهێشت... بەهەڵچوونەوە گەڕایەوە شوێنی خۆیی و رووی کردە هاوەڵە داماوەکەی و بێ بەخێرهاتن: ئەم خەڵکە زۆر سەیرن، پێی دەڵێم نرخەکەی لە سەر نووسراوە، پێم دەڵێت کەمتر نابێ؟ وادەزانێت من میوە فرۆشم !!...لە گەڵ ئەو قسەیە، سەوی شاگردی چایخانەی سەری کۆڵانەکە، کە بۆ بردنەوەی پیاڵەکەی هاتبوو، پاش بەخێرهاتن و چاك و چۆنیی لە گەڵ جوتیار، رووی کردە هەژار و: دوکتۆر، وەستا گوتی سلاوی لێ بکە و پێی بڵێ حیسابەکەی زۆر بووە... ئەویش بە بێزاری: تۆ جارێك تاخمە چایە و ئاوی ترمان بۆ بێنە...

ماوەیەکی درێژبوو، ئەو جوامێرە لە گەڵ ئەو جۆرە وەلامانە راهاتبوو، بە کەمتەر خەمییەوە پیاڵەکەی هەڵگرت و لە دوکانەکە دەرکەوت، هەژاریش، دەپەداری شەترەنجەکەی لە دەلاقەکەی تەنیشت سەری جوتیار هێنایە خوارەوە و لە سەر دارمێزەکەی بەرامبەری داینا و دانیشت، لە گەڵ ڕێکخستنی پارچەکان، بێ سەربەرزکردنەوە: ها چیت کرد؟... ئەویش بە بێتاقەتی گوتی: تەواو... بەلام وریابە... دایکم با نەزانێت، کە من بە نارەزووی خۆم دەگوازرێمەوە... هەژار قومێکی لە جگارەکەی دا و جارێکی تر رووی تێکرد و گوتی: ئەو شەو چۆن بووی؟... جوتیاریش گوتی: هەر وەك جاران !!... ئەویش لە گەڵ قومێکی تر: رۆمانەکە چیی لێهات؟... هەروەك خۆیەتی..... جوتیار لە گەڵ ئەو قسەیە، ماوەیەك بێ دەنگ بوو، پەرتووکەکەی داخست و گەڕاندیەوە شوێنی خۆی ولە گەڵ ڕێکخستنی پارچە شەترەنجەکانی خۆی، قسەکەی تەواو کرد و: بێ هۆدەیە، هەر شەو بە چەند لاپەڕەیەك کۆتاییەکی تری بۆ دەنووسمەوە، بەیانیش کە دووجار و سێ جار دەیخوێنمەوە، ئیتر وەك

جاران دەیاندڕێنم و ورد وردیان دەکەمەوە، پلە ئایشیش بە پۆرەپۆر ئاودیووی زبڵدانەکەی دەکاتەوە..... دیسان بێ پچڕاندنی قسەکانی، داشێکی شەترەنجەکەی جووڵاندەوە وگوتی: رۆمانی نوێ نەگەیشتن؟... نا بەڵام ژمارەیەك لە رێگان.لە گەڵ ئەو وەڵامدانەوەیە، هەژار داشەکەی گواستەوە، دوو جگارەی دەرهێنا، یەکێکیانی پێشکەشی جوتیاری کرد و هەردووکیانی داگیرساند، سمۆی شاگردیش هەر هەمان کات تاخمە چایەکەی هێنا و داینا لە بەردەمیان، ماوەیەك لە دیار سەریان وەستا، بە تامەزرۆیی لە گەمەکە وردبۆوە، پاشان هەر کە گواستنەوەی داشی دووەم دواکەوت، نەوەك وەستاکەی بە جنێودان و قسەی قۆڕ بانگی بکات، بەخێرایی بۆ سەرکاری خۆی گەڕایەوە.

سمۆ گەنجێك بوو تازە پێدەگەیشت... خەڵکی لادێ بوو... لە بنەماڵەیەکی جەنگەڵی و شەڕانی دەژیا... باوکی تامەزرۆی شەڕ و ئاژاوە نانەوە بوو... بەردەوام مشت و مڕی بوو لەگەڵ دراوسێ و سەرجەم خەڵکانی دێیەکە... بگرە دەبوایە هەر رۆژ یەخەی کەسێکی بگرتایە، ئەگەر نا، ناچار دەبوو دەستەو یەخەی یەکێکی ئەندامانی خێزانەکەی دەگرت... دروشمێکی سەیری لە ژیان هەبوو... دەیگوت: ئەو کەسەی رۆژێ دوو سێ جار کەللەی سەری نەشکێت هەر پیاو نییە... ئیتر نەریتێکی رۆژانەی بوو... دەبوایە هەر رۆژ چەقە چەق و دەمە قاڵیەکی بکردایە، ئینجا چ لە سەر مریشکێك یان مەڕێك یان منداڵێك، ئەمەیان گرنگ نەبوو، گرنگ ئەوە بوو بچووکترین هۆکار هەبێ، تا ئەو بە شارەزایی خۆی تینی بدات و گەورەی بکات، ئینجا بەگەرمی بەگژی بەرامبەرەکەی دا بچێت و پەلاماری بدات... بە پێچەوانەوە، سمۆی کوڕی مرۆڤێکی زۆر سازگار و ئاشتی خواز بوو... لەو بەدڕەوشتییەی باوکی بێزار ببوو... چەند جار بە هۆی ئاژاوەنانەوەی باوکی تووشی نەهامەتی ببوو... چەند جار بە ناچاری لە پشتگیریکردنی باوکە شەڕخوازەکەی سەری یان قاچی یان دەستی شکابوو... زۆر هەوڵی دا باوکی دەست لەو بەدڕەفتارانەی بەردات، بەڵام بێ هودە بوو... هەرچۆنێك بێت، سمۆ بە

یەکجاری لەو ژیانە تاڵەی بێزاربوو، بۆیە بڕیارێکی بن بڕی دا... ئیتر لەمەودوا هەرگیز لە سەر ناهەقی لایەنگری باوکی نەکات و لەشەڕەکانی بەشدار نەبێت... زۆری نەخایانـد باوکی دەستەو یەخەی بنەماڵەیەکی تری گـرت... هۆیەکـەش ئـەوە بـوو، یـەکێك لـەو بنەماڵەیە بۆ خۆی فیکەی لێدەدا، کەچی ئەو رازی نەبوو فیکـە لێبـدات... کـە پێیـان گوت: هەر کەس ئازادە بۆ خۆی فیکە لێبدات، ئەو گوتی: نا نا، فیکەی حەرامزادەکان دیـارە... ئـیتر پـاش دەمەقاڵـە، بەگژیەکدیـدا چـوون و جـەنگێکی تـر راگەیانـدرا... جەنگەکە پەرەی سەند، هەردوو بنەماڵەکە رووبەڕووی یەکتر بوونـەوە... سمۆ هـەر لـە سەرەتاوە ئاگای لە چۆنیەتی دروستبوونی شەڕەکە و چۆنیەتی پەرەپێدانی بوو... دەیزانی لەو شەڕەش هەر باوکی ناهەقە، بۆیە سوێندی خوارد، ئەگـەر بـاوکی لـە پـێش چـاوی بکوژن بەشداری نەکات... لەگەرمـە گەرمـەی شـەڕەکە، سـێ چـوار کـەس پـەلاماری باوکیان دا و بەسەختی برینداریان کـرد و خـستیان... بـەوەش وازیـان لێ نـەهێنا، بـە مست، بە دار، بە بێڵ، بە تەور، بە بەرد، بەهەرچییەك کەوتـە دەسـتیان، دایـان لـە سەر و پشتی... باوکە هاوار هاواری بوو، بەڵام هەر کەس، بەش بـە حـاڵی خـۆی دژی هەبوو، بۆیە کەس بەفریای نەچوو... خەریك بوو لە ژێر زەبر و زەنگی لێدانـەکان گیـان بدات... ناڵە ناڵەی بوو... لە رزگارکردنی گیانی نائومێد بـوو... ویـستی بەیـەکجاری چاوەکانی بنوقێنێ و خۆی بداتە دەست عزرائیل، بەڵام لە پڕێکا و لە دوورەوە چاوی بـە کوڕە جوامێرکەی کەوت، چەند هـەنگاوێك دوور، هـەر لـە ژێـر سـێبەری بنەتووەکـەی توخیب گۆڕەپانی شەڕەکە، ئانیشکی دابۆوە، زۆر کەمتر خەم و بـێ لایـەن سـەیری ئـەو پێکدادانە خۆێناوییەی دەکرد... باوکە قیژانـدی و هـاواری بـۆ بـرد: (هـەی ئاپیـاو... خەریکە باوکت بکوژن... بەفریام کەوە... کوڕە مردم... کوڕە دەستهەڵێنە ئەگـەر نـا، گەردەنت ئازا ناکەم)... وەك بڵێن، کەڕ و کوێرە، کوڕە تەقەی سەری دەهات، نە هەستی پیاوەتیی بزوا و نە لە شوێن خۆی جووڵایەوە... باوکە کە هێشتا هەر دار باران دەکـرا و پەیتا پەیتا هەناسەکانی زیاتر دەپچڕان، ناچاربوو پەنا بۆ تەڵەکەبازی ببـات، بـەرماوەی

توانا پەرت و بڵاوەکانی جەستە وردکراویەکەی کۆکردەوە، بە هەموو هێز و توانایەك، گوڕی هێنایە خۆی و بانگێکی تۆقێنەری ڕاگەیاند: (نەکەی سمۆ... نەکەی کوڕم... نەکەی نەکەی... کوڕە نا، تفەنگ بەکارمەهێنە... ناوی خوا بێنە... خەڵکینە هاوارە سمۆ بگرن... بیبگرن، ئەگەر نا دەکوژێ و زەبری کوژێنەر دەوەشێنێ و ماڵمان وێران دەکات)... لە گەڵ بیستنی ئەو بانگەوازە ترسناکە، هەردوولا تێکڕا لە شوێن خۆیان وەستان، لایەنی نەیار بە چاوترووکانێك ڕوویان کردە سمۆ و پێش ئەوەی ئەو هەلەی بۆ بڕخسێت و کەسێکیان بکوژێت... وەك ڕەجمی شەیتان، بە دەست، بە دارلاستیك، بە بەردەقان، بەرد بارانیان کرد و سمۆی بەستەزمان و ئاشتی خوازیان لە گەڵ زەوی درێژ کرد و پەکیان خست... بەڵام لە خۆشبەختی سمۆ، هاوکات ئوتومبێلێکی بەقالی لە دێیەکەیان بوو، ئیتر یەکسەر لاشەکەیان گەیاندە خەستەخانەی شار و پاش چەند هەفتەیەك باری تەندورستی چاکبۆوە، بەڵام ئەو خۆی لە کەس و کاری دەدزێتەوە، لە خەستەخانەکە هەڵدێت و ئەوەتا ماوەی شەش مانگە، بە شاراوەیی بەبێ ئاگاداری ماڵەوەی، لەو چایخانەیە کار دەکات، هەر بەو ڕێگایەشەوە، هاوڕێتیی لە گەڵ هەژار و جوتیار خۆش ببوو، نەك هەر لە پەرتووکخانەکە، بەڵکو زۆر جار لە ماڵەوەش یارمەتیی دەدان، مام مەجید و پلە ئایشیش زۆر خۆشیان دەویست و هەر کە سەردانی ماڵیانی دەکرد، مام مەجید بە گاڵتەبازیی خۆی هاواری دەکرد و دەیگوت (سمۆ بگرن)... هەژار مژێکی درێژی لە جگارەکەی دا و ماوەیکی زۆر دووکەڵکەی لەناو سیپەلکەکانی هێشتەوە، ئینجا لە گەڵ بەردانی بەرماوەی نیکۆتینەکە بە ئەسپایی گوتی: ئەم کارەی منیش هیچ بەرهەمێکی نییە... وابزانم خۆم بکەمە مامۆستا زۆر باشترە !...جوتیار پاش گواستنەوەی داشێکی تر، یەك دوو فووی لە جگارەکە هەڵکێشا و بە گاڵتەوە: تۆ دەرچووی زانستی دەروونی و دەتوانی لەو بوارە کار بکەیت... هەژار بە زەردەخەنەیەکی دەستکردە، قوومێکی تری لە جگارەکەی دا و بە ناڕەزایی: ئینجا ئەم خەلکە مێگەڵەیە کەی بڕوایان بە زانستی دەروونی هەیە؟! هەتیوو ئەمانە نەك هەر بۆ نەخۆشی دەروونی،

بگرە بۆ چاو و ددان ئێشانیشیان پشت بە نوشتە دەبەستن... جوتیار لە گەڵ ئەو وەڵامە بێدادیەی، چیرۆکەکانی خۆی و ئەو هاوەڵە پسپۆڕەی لە بواری دەروونزانین هاتەوە بیر، کە نەك هەر دەیان جار بگرە سەدان جار بۆ زانینی ئایندەیان، هەردووکیان پێکەوە ناو لەپی خۆیان بۆ سارای فالچی دەکردەوە، بەزەردەخەنەوە، فلتەری جگارەکەی لەناو تەبلەکە پلیشاندەوە، لە شوێنی خۆی هەستایەوە و لە گەڵ بەجێ هێشتنی شوێنەکە: خۆزگە شێوەی رەفتارت لە گەڵ کڕیارەکان نەرمتر دەبوو، ئەوسا بەرهەمی پەرتووکخانەمان دەبینی و منیشت جارجار میوان دەکرد... هەرچۆنێك بێت، ئەمشەویش میوانی منی و هەر لە سەر رێگاشم ئەمجارەش حیسابی چایەکانت دەدەمەوە بەڵام با دواجاربێت!

لە گەڵ وەبیرهێنانەوەی دوا گاڵتە و کەپەکانی لە گەڵ هەژار، جاروبار خۆنەویستە زەردەخەنەیەکی پیشاندەدا، بە دڵ بیری ئەو تاقە هاوەڵەی دەکردەوە، بە درێژایی بیست ساڵ پێکەوە دەژیان، ئەمە یەکەمجاریان بوو لێك دابڕێن، ئەوان هەر لە یەکەم قۆناغی سەرەتای خوێندنیان، لە یەك پۆل ولە سەر یەك تەختەدار دانیشتن، کە ناویان لە پەیمانگای مامۆستایانیش دەرچوو، هەر چەندە هەژار ناوی لە بەشی زانستی دەروونی دەرچوو و ئەویش لە بەشی زمانی کوردی، کەچی لە گەڵ تەواوبوونی وانەکان، بەخێرایی لە گۆڕەپان و یانە و پەرتووکخانەی پەیمانگاکە دەگەیشتنەوە یەك، ماوە ماوە لە یەکدی جاڕس دەبوون، کەچی لە یەك دان زیاتر بەرگەی لێکدوورییان نەدەگرت، هەردووکیان هاوتەمن بوون، بە پێچەوانەی جوتیار کە گەنجێکی باریك و رەشتاڵە و درێژ بوو، هەژار کورتە باڵا و قەڵەو و سپیکەلە بوو، لە تەمەنی پازدە ساڵیدا بوو، کە باوکی مرد، پاش سێ ساڵ دایکی شووی کردەوە... زۆر دڵگران بوو، ئەوەی زیاتر هەراسانی کرد، نیشتەجێبوونی زڕباوکی بوو لە گەڵیان... پاش چەند مانگێك، ئەو زڕباوکە بە بەهانەی بێ بەرهەمی پەرتووکخانەکە ویستی بیفرۆشێت و کارێکی تری پێ بکات... هەژاریش کە ئەو شوێنە پیرۆزەی لە گەڵ رۆحی ئاوێتە ببوو، هەر پارچەیەکی، شوێن پەنجەی باوکی پێوە دیار بوو... ئیتر کە نەیهێشت، هەر رۆژە و بە بەهانەیەك بە

روویدا هەڵدەشاخی، تا بە تەواوی لێك دابڕان و سوێندی بە تەلاق خوارد، تا مردن نەهێڵێت ئەو و دایکی یەکدی ببینەوە، ئێستاش پاش چەندین ساڵ، هەرچەندە خوشك ودوو برای تری لەو زڕباوکە پەیدا ببوون، کەچی ئەو کابرایە دڵڕەقە هەر لە سەر سوێندەکەی پابەندبوو و نەیدەهێشت لێك نزیك ببنەوە و بە دیداری یەکدی شاد ببنەوە.

هێزێکی شاراوە بۆ ئەو هاوەڵەی رایدەکێشایەوە، بیری لەوە دەکردەوە: ئایە دەکرێت بێ ئەو لەو کەش و هەوا نامۆیەدا بژیت؟... پاشان هەر لە دڵی خۆی کەمێك هەستی بە دڵدانەوە کرد، کە هێشتی مام مەجید و پلە ئایشیش لە گەڵیدا سەفەری ئەو دێیە ترسناکە بکەن... ئیدی ئەو رۆژەش، جوتیار پاش ئەوەی لیستی پێداویستیەکانی قوتابخانە و ناوی ئەو قوتابیانەی ئارەزووی خوێندنیان هەبوو، خستیە جەنتاکەی و بەیانی زوو بە دەم خەوەوە بە تەنیا جێبە شینەکەی مام مەجیدی لێخوڕی و بەرەو شار بەڕێکەوت... لە سەرخۆ ئوتومبێلەکەی لێدەخوڕی، نوقمی ناو لێکدانەوەی بەسەرهاتە دڵتەزێنەکەی شەوی رابوردووی دیوەخانەکە ببوو... هەرکەس، بە گوێرەی ئاستی کۆمەلایەتی، لە شوێنە گونجاوەکەی دانیشتبوو... تێکرا بە وردی گوێ لە وتە بە نرخەکانی ئاغایان دەگرت... پلەو پایەی هەر یەکێکیان لە دوورونزیکی شوێنی دانیشتنەکەی بۆ ئاغا بەدی دەکرێت و هەڵدەسەنگێنرێت... ئافەرین بۆ ئەو کەسەی بتوانێت بە گاڵتەیەك، قسەیەکی خۆش، بەسەرهاتێك، چیرۆکێك، یان بە گێڕانەوەی هەر رووداوێکی سەیر، لێهاتوویی خۆی بسەلمێنێ و سەرنجی ئاغا بۆ خۆی راکێشێت و بزەیەك بخاتە سەر لێوانی... رەزامەندی ئاغا، گەورەترین پاداشتە بۆ هەر کەسێك هەوڵ بدات خۆی لە زەبروزەنگی دارودەستە دڕندانەکەی بپارێزێ، بەلام ئەو شەو پیچەوانەی شەوانی رابوردوو، سەرەڕای ئەو هەموو هەولانەی بۆ دڵخۆشکردنی دەدران، کەچی هەر تووڕە و دڵگیر دیاربوو. لەوانەیە مەسەلەی ئامێری بڵندگۆیەکەی مزگەوت هۆکاری نارەحەتیەکەی بێت، لەوانەیەش سستی پەڕاندنەکەی ئەو بەیانییەی هۆی دڵتەنگیەکەی بێت، کە نەیتوانی پڕ بەدڵ کارەکەی ئەنجام بدات و جۆشی حەزوئارەزووەکانی ئاخی وەك

پێویست دامرکێنێتەوە، لە وانەیەش دانیشتنی میوانە ناویستراوەکانی شاری لە سەرووی دیوەخانەکە و بێ دەستپێشخەری ئەو، کاریگەری خۆی هەبێ، چونکە سەرەڕای ئەوەی هەر لە بنەڕتدا حەزی لە چارەی مامۆستایان نەبوو، ئاکرێتیش کەس بێ ڕەزامەندی ئەو خۆی هەڵسەنگێنێ و بە ئارەزووی خۆی شوێنی حەسانەوەی لە دیوەخان دەستنیشان بکات، هەر چەندە ئەوان بە یاوەری مەلای دێیەکە هاتبوونە سەردانی و هەر وەك باوەش، وەك ڕێزلێنانێك بۆ میراتگری پێغەمبەران، لە هەمو کۆچك و دیوەخانێك، مەلا هەمیشە لە سەرەوە، شان بە شان ئاغا دادەنیشێت، کەچی مەلا ساڵح ئەو ڕێزەی لێ نەدەگیرا، زۆر جار وەك کەسێکی گاڵتەچی، ئاغا و پیاوەکانی گاڵتەیان پێ دەکرد و شەویان پێ رادەبوارد، لە مانگی ڕەمەزانی رابردوو، چەند جارێك پێش ئاوابوونی خۆر، مەلا ناچاربوو لە سەر فەرمانی ئاغا بانگبدات، خەڵکەکەش کاتێك بە بۆڵە بۆڵ نارەزایی خۆیان دەردەبڕی، پێی دەگوتن بخۆن و تۆباڵتان لە ملی ئاغا، نەك هەر ئەوندە، بگرە جارێکیان بە شایەتی عەولا و خولامێکی تر، مەلایان ناچارکرد لە بیست و هەشتی مانگدا کەباری جەژنی ڕەمەزان هەڵدات... ئیتر مەلا ساڵح بە پێچەوانەی زانایانی ئایین، بۆی نەبوو بێ خواستی ئاغا لەو شوێنە دانیشێت، بەلام ئەو شەوە لە شەرمی جوتیار و مام مەجید نەوەك تانەی بێ ڕێزیی لێ بدەن، لە شوێنە سروشتییەکەی دانیشتبوو، هەر کە ئەو هەلەی بۆ روخسا، لە شوێن خۆی بەرووخسارێك کە ترس و نیگەرانیی پێوە دیار بوو، سەیرێکی جوتیاری کرد و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و: هەر هاتی؟! مەلا ساڵح، کابرایەکی رەشتاڵەی قەلافەت درێژ بوو، بە پێچەوانەی زانایانی ئایین، ئەو زۆر حەزی لە خۆشووشتن نەبوو، بگرە لەوانەیە هەفتەی جارێك زیاترخۆی نە دەشووشت، ئەویش بە بۆنەی پێشکەشکردنی وتاری هەینی و لە ژێر تەنگ پێهەڵچنینی هاوسەرەکەی، زۆر جار لە بۆگەنیا کەرووی هەڵدەهێنا، بۆیە تێکڕای نووێژکەرانی ئەو دێیە، زۆرجار دەستیان لەو خێرە بەردەدا، گوایە نووێژی پاش ئیمام خێری زیاترە، کاتێك لەو دێیە نیشتەجێ بوو، لە تەمەنی سی ساڵیی دابوو، ئەوەیان

گوندی هەشتەمی بوو، کە بویٚ بگوازرێتەوە، تەنها لەو گوندە نەبێت، کە ئاغا سووربوو لە سەر مانەوەی، ئەگینا لە هیچ گوندێك زیاتر لە شەش مانگ نەماوەتەوە، چونکە سەرەڕای قسەی حەلەق و مەلەق و پیس و پەلۆسی، هەر کە ئەو هەواڵە ناباوە دەگەیشتە خەڵکی دێیەکان گوایە مەلا ژنەکەی رەفاندووە، تەنگیان پێ هەڵدەچنی و تووشی دەربەدەری و ئاوارەییان دەکردەوە...لە راستیدا هەر چەندە ملا ساڵح هەر دوازدە عیلمەکەیشی تەواو نەکردبوو و ئیجازەی مەلایەتی وەرنەگرتبوو، بەڵام لە بواری فیقھ و شەریعەتەوە زانیارییەکی باشی هەبوو، تەنها ئاغا و پیاوەکانی بەو مەسەلەیەیان دەزانی، بۆیە ئاغا بۆ بەرژەوەندی خۆی پشتگیری لە مانەوەی دەکرد، ئەویش لە بەرامبەردا بۆ پاراستنی پەنهانەی ئەو خاڵە لاوازەی، زۆر جار بۆ دڵدانەوە و رازیکردنی ئاغا خۆی لە رێسا شەرعییەکانی لادەدا و بە ویستی ئاغا فتوای دەردەکرد... نەك هەر ئەوەندە، بگرە خولامەکانی ئاغاش شەرمیان لێ نەدەکرد وئەگەر کەسێکی دێیەکە ئامادە نەبوایە، وەك قەشمەرێك گاڵتەیان پێدەکرد... هەر چەندە مەلا جاروبار هەوڵی دەدا سەنگی کەسایەتی خۆی بپارێزێت و ناچاریان بکات تا رێزی لێ بگرن، کەچی ئەو پێچ و پەنایەی لە گەڵ ئەو چەقاوەسووانە سەری نەدەگرت... جارێکیان بە ئامادەبوونی ئاغا، مەلا رووی کردە عەولا وپێی گوت: عەولاّ ئێستاش هەر نوێژ ناکەیت... ئەویش گوتی: ئەی ئەوە نەبوو پێش چەند رۆژێك لە پشتەوەت سەرمەقولانێکم دا، مەلاش بە پێکەنینەوە گوتی: ئەگەر هەلە نەبم ئەو نوێژەت لە ناچاری و لە شەرمی ئاغا بوو... عەولاش بەرووتاڵی وەلامی دایەوە و گوتی: مەلا ئێوەش ئەوەندە رووی خەڵك مەشکێنن... ئاخر خولامەکان کەی نوێژیان لە سەرە؟... ئیتر بۆ نموونە، ئەوەتا عەولا، هەر چەندە گەورەترین باوڕپێکراوی ئاغاشە، بگرە هەمیشە ئامادەشە بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی ئاغا و بەجێهێنانی فەرمانەکانی، هەموو یاسا و شەریعەتە پیرۆزەکانی ئاسمانیش پێشێل بکات، کەچی سەرەڕای ئەوەش، هەر لە بەر دەرگاکە وەك سەگێك وەستاوە و چاوەڕێی فەرمانەکانی ئاغا بوو کە لە پڕێکا: عەولاّ کوا عەزۆ؟...

لەگەل بیستنی دەنگی ئاغـا، بـێ دەنگـی سەرانسەر دیوەخانەکـەی داگـرت، زەنگـی مەترسی لێدرا، ئەوان چاك شارەزای مەغزای ئەم جۆرە پرسـیارانەن، بـە حەپەسـاوییەوە دەمیان داپچڕاو و چاویان بڕییە دەمی عەولاّ: ئامادەیە قوربان... بـانگی بکـە... هـەر وەك چۆن گورگێکی برسی پەلاماری بەرخێك بدات، ئەوەتۆ عەولاّ بە گەرمی لـە شـوێن خۆی راپەڕی و پەلاماری ئەو جەستە لاوازەی دا، کە تەنها کۆمەڵە ئیسقانێك بوو و بە چەرمێکی وشك پۆشرابوو... هەر لە ئێوارەی ئەو زستانە سارد و سڕەش لە بن هەیوانی دیوەخانەکـە راگیرابـوو، زۆر بـە تونـد و تیـژی یەخـەی گـرت و پەلکێـشی ناوەنـدی دیوەخانەکەی کرد و بەرامبەر ئاغای راگرت... ئاغاش ماوەیەك بە سووکی لـە سـەر و سیما زەرد هەڵگەڕاوەکەی وردبۆوە و لە سەرخۆ: هەتیو دوێنێ لە کوێ بووی؟... عـەزۆ کە یەکێك بوو لە شوانەکانی ئاغا، بە رووخسارێکی تۆقێنراو، لە ژێر کاریگەری ئێش و ئازارە سەختەکانی شوێن پەنجەی لێدانی خولاّمەکان دەینالاّند، لەو دەمەی کە بێـدەنگی سەرانسەر دیوەخانەکـەی داگرتبـوو، کوتـە کـوتی دڵـی ئـەو بەسـتەزمانە لـە دوورەوە دەبیسترا، بە ئەستەم توانی لێوەکانی ببزوێنێ: قوربـان دوێنـێ لـە ژێـر سـەختی ژانـی ددانەکانم، لە هۆش خۆم چووم و... ترس و لەرزی ئەو بەستەزمانە، زیاتر ئاغای هانـدا، تاکو لە رێگای ئەو بێکەسەوە، بەرامبەر میوانە تازەکـان، زەبروزەنگـی دەسـەلاّتەکەی بسەلمێنێت، وەك تەقینەوەی بومبایەك لە کەش و هەوایەکی ئارام، ئاغا تا لـە توانـای دابوو، قیژاندی و سەرجەم دانیشتوانی راچڵەکاند: سەگی سەگباب، ئەمـەیان چ ئـاین و ئۆینێکە؟ بە ئەگەری ددان ئێشان و بێ ئاگاداری ئێمە مێگەڵەکەت جێ بهێلی و هـات و چووی شار بکەیت !! بەخوای ئاغایەتیمان کرد !!! کرمانجی ئەم زەمانە بۆ دەرهێنـانی ددانێك رووبکەنە شار و دوختۆرەکان !!... هەر کە ئاغا کەمێك بێ دەنگ بوو، تێکڕای هەناسەکان پچڕان، کەس نەما پێ لە مەرگی خۆی بنێت و لە شوێن خۆی ببزوێت، ئاغـا هەناسەیەکی قووڵتری هەڵکێشاو: عەولاّ، بابزانین هیچ ددانێکی دەرهێنـاوە؟!... پـێش ئەوەی عەولاّ پەلاماری بداتەوە و بە پەنجە رەشەکانی لێوە وشك و زەردەکانی هەڵدڕێت و

لە ددانە رزیوەکانی بنۆڕێت کە ژمارەی سەر و بنیـان لـە ژمـارەی پەنجـەکانی هـەردوو دەست تێنەدەپەڕین، عەزۆ کە ئەوکاتە دەنگی لێدانی دڵـی بـەرز و خێراتـر دەبیـسترا و خەریك بوو لە خۆی بچێت، بە چاوترووکانێك خۆی خستە سەر ئەژنووکانی و بە رواڵەتی پاڕانەوە رووی لە ئاغا کرد و: گەورەم لە بەر کوڵی پووەکانم، دوختۆر تەنها دەرمانی بـۆ نووسیم و... وەك بڵێن نهێنیە گەورەکـەی گـەردوونی ئاشـکراکردبێت، ئاغـا لـە گـەڵ بیستنی ئەو قسەیە، پێکەنینێکی شێتانەی بەردا، بە لە خۆبایی، بـۆ ئـەم لاو ئـەو لای دیوەخانەکە ئاوڕی دایەوە و لە دەم و چاوی یەکە یەکـەی دانیـشتووان وردبـۆوەو: بـزانن چەوساندوویانەوە، پارەکەیان لێی سەندووە و ددانەکەشیان دەرنـەهێناوە، هـەتیوو ئێمـە مەگەر لە بەرژەوەندی ئێوە نەبێ، بۆچی شارتان لێ قەدەغە دەکەین؟ کاکە خەڵکی شـار زۆر بێ ویژدانن !! هەر کە زانییان خەڵکی لادێن، بە ئاسانی هەڵتان دەخەڵەتێنن، رەنجی ساڵانەتان لێ قووت ددەن، گیرفانەکانتان دادەماڵن، ئەگەر نا، وەك پیران دەڵێن ددان کە ئێشا، چارەکەی هەر دەرهێنانە، وانییە عەولا؟... ئەم دوا گوتـەی ئاغـا لـە چـفرەیەك دەچوو، چونکە لە گـەڵ درکانـدنی، عـەولا دەسـتبەجێ پـەلاماری ئـەو بەسـتەزمانەی دایەوە، پلایسێکی ژەنگداری لـە پاغـەڵی دەرهێنـا، وەك پـشکنینی دەم و ددانـەکانی ئاژەڵ، کەمێك لە ددانە ژاندارەکەی وردبۆوە، ئینجا بەچاوترووکانێك ئەشـتەرگەرییەکی ئەنجام دا و ددانەکەی خستە ناو لەپی و: بگـرە ددانەکـەت، کـەمێك ئـاوەخوێ لـە نـاو دەمت وەردە و ماوەیەك خۆت لە ساردی بپارێزە...

وا دیاربوو، هەڵچوونەکەی ئاغا کەمێك بەو بەزمە داهاتەوە، بە گـەرمی پێکـەنی، قوڕبەسەر ئەو کەسەش لە سەر ئاوازی ئەو پێکەنینەش سەما نەکات و پێنەکەنێت، ماڵ وێرانیش بۆ هەرکەسێك پێکەنینەکەی لە پێکەنینی ئەو بەرزتر یان درێژتر بکـات، ئـەو کات هەر ئاغا خۆی دەزانێت چیی بەسەر دێنێت، ئاغا لە گەڵ پێکەنینـە ترسـناکەکەی جار و بار بەلاچاوێك سەیرێکی میوانە تازەکانی دەکرد وسمێڵە بۆرەکـەی بـۆ هـەردوولا بادەدا، هەر کە پێکەنینەکەیشی تەواو بوو، بە خەندەیـەکی دەسـتکردە: بزانـە عـەولا

کەسێکی تر ددانی ژان ناکات؟... لە گەڵ ئەو قسەیە، بێ دەنگیەکی دڵتۆقێنەر، سەرانسەر دیوەخانەکەی داگرتەوە، عەولاش کە هێشتان پلایسەکەی لە دەست بوو، بە لە خۆبایی ماوەیەك لە رووخساری یەکە یەکەی دانیشتووان ورد بۆوە، هەر کە کەسێکی بوێر نەبوو پەردەی ئەو بێ دەنگییە بپچڕێنێت، ئاغا بە سەر لەقاندن: ئافەرین عەولا ئافەرین !!... وەرە وەرە، هەر لە تەنیشت مەلا و میوانە بەرێزەکان دانیشە... ئەوەك جوتیار، کە شان بە شانی مەلا دانیشتبوو، هەڵوەستەیەکی سەرنج راکێش ئەنجام بدات، مەلا خێرا و بەتوندی دەستی لە سەر چۆکی دانا و نەیهێشت خۆی بجوڵێنێت، هەر کە عەولاش بە پەرۆشییەوە ویستی شوێنی خۆی لە نێوانیان بکاتەوە، مەلا: نا نا عەولا نابێت، تۆ دەبێ لە سەرەوەی منیش دانیشی، وەرە ئەم لاوە، خوا بتگرێ تۆ کەی فێری ددان کێشان بووی؟... ئەی چۆن مەلا؟ بە سەری تۆ نەك هەر ددان، بگرە رۆح کێشانیش لای من ئاوخواردنەوەیە !!... پێش ئەوەی عەولا بەتەواوی لەو شوێنە نایابەی گیر بێت وچێژی لێ وەرگرێت و هەناسەی لە خۆبایی هەڵمژێت، ئاغا ئەو شەو پێچەوانەی هەموو شەوانێك، زووتر هەستا و دیوەخانەکەی چۆڵ کرد، لە گەڵ یادکردنەوەی ئەو بەزم و رەزمەی دوێنێی شەوی دیوەخان، کە لە سەر داوای خۆی، تاکو لە نزیکەوە ئەو کەش و هەوایە تاقایکاتەوە، لە گەڵ مام مەجید و مەلا سالح سەردانیان کردبوو، بیری لە قسەکانی مام مەجیدیش دەهاتەوە کە زۆر جار دووبارەی دەکردەوە: گوایە جاران ئەو ئاغایە بە کارتوون بتڵی ئارەقی بۆ فلان بەرپرس دەکردە دیاری و لێی دەپاڕایەوە تاکو بەرامبەر خەڵکانی ژێر فەرمانی بە سووکی مامەڵەی لە گەڵ نەکات، ئیتر هەر لە سەر قسەی ئەو: زۆربەی دەسەڵاتدارەکان لە سەرانسەر دونیا، باجی مانەوەی دەسەڵاتیان دەدەنە خاوەن دەسەڵاتێکی بالاتر، ئینجا بە پاڵپشتی ئەو خاوەن دەسەڵاتانەش، خۆیان لە سەر چینی رووتەورووتە دەچەسپێنن، ئەو مێگەڵەش کە بریتییە لە چەندین جۆرە ئاژەڵ، خاوەن دەسەڵاتەکان تەنها جۆری لاوازی وەك عەزەی بەستەزمان هەڵدەبژێرن، تا بیکەنە عیبرەت بۆ کەسانێکی تر، ئەگەر نا، خۆ پێش ئەو رووداوە بە چەند رۆژێك

حاجی هەمزە بێ پرسی ئاغا سەفەری شاری کردبوو و کەسیش نەبوو لە ترسی خـوارزا و برازاکانی تەنگی پێهەڵچنێت، هەر ئەویش بوو پێش مانگێك بە هاندانێکی نهێنی مەلا بـۆ کردنـەوەی قوتابخانـەی دێیەکـەیان سـەردانی بەڕێوەبەرایـەتی پـەروەردەی کـرد و ڕەزامەندیی وەرگرت وخەڵکەکەی بۆ قوتابخانـە هانـدا، زۆرجـار بـە نووسـینی ڕاپـۆرتی نهێنی، ئاغا هەوڵی دەدا، قەناعەت بە بەرپرسانی دام و دەزگای هەواڵگری بێنێت گوایە ئەو بنەماڵەیە دژی دەوڵەت جووڵە دەکەن، کەچی لە بەر نەبوونی بەڵگە و زۆری ژمارەی کەس و کارانی، دەستکاری نەدەکران، ئیتر وەك دەسـتپێکێك بـۆ هەڵدانـەوەی لاپـەڕەی ژیانێکی گەشتر، حاجی هەمزە ئەو هەنگاوەی هاوێشت و بەگەرمی پێشوازی لە جوتیار و بنەماڵەی کرد و خانووی ئەو کوڕە جوانەمەرگەشی پێبەخشین کە پـێش چـەندین سـاڵ بە ڕووداوێکی نادیار گیانی لە دەستدا، هەروەها لە سـەر قـسەی مـام مەجیـد، درۆش شێوازێکیتری سەرەکی بوو کە ئاغا هەمیشە بۆ قایمکردنی پلەوپایە و خۆزلکردن پـشتی پێ دەبەست، مام مەجید و مەلا ساڵح جاروبـار لـە کـاتی خواردنـەوە بـۆ خۆشـکردنی دانیشتنەکەیان هەندێ لە درۆکانی ئاغایـان بـۆ جوتیـار ئاشـکرا دەکـرد، خۆشـترینیان ئەوەبوو، هەرکاتێك بە هـۆی دانیـشتن و هاتووچـوونی لـە گـەڵ فەرمانبـەرانی مـیری بیزانیایە یەکێکیان بەم زووانە دەگواسترێتەوە شوێنێکی تـر، یـان بـە هـەر هۆیـەك لـە کارەکەی لادەدرێت، ئەو دەستبەجێ بە شارەزایی خۆی سوودی لەو زانیارییە وەردەگـرت و لە نایابترین شوێن و کاتدا، پاش ئەوەی یەکێك لە خولامـەکانی ئـەو زەمینەیـەی بـۆ خۆش دەکرد وبە خراپی باسی ئەو فەرمانبەرەی دەکرد، تا ئەویش بە هەڵچوونەوە بڵێت: من کوڕی ئەو باوکەم نەبم ئەگەر هێشتم ئەو سەگبابە چیتر لەو شوێنەی بمێنێتـەوە، لـە گەڵ بیرهاتنەوەی ئەو قسەیە، جوتیار خۆنەویستە پێکەنینێکنی نەرمی بەردا، بەڵام هەر کە ئەو دیمەنە شاخاوییە کەوتەوە پێش چـاوی کـە دەبوایـە ملـی هـەوراز و و نـشێویی بگرتایە، پێکەنینەکە لە ناخیدا پچرا، قسەکەی مام مەجیدی هاتەوەبیر، کە یەکـەم ڕۆژ لە کاتی هاتنیان بۆ ئەو دێیە، هەر کە گەیشتنە هەمان ئەو شوێنە گوتی: ورچی ئەوەندە

زەبەلاح لە بەرزایی ئەم شاخانە هەن، جاروبار کەوری ئەوتۆ گەورە بەردەدەنـەوە، ئەگـەر یەکێکیان بە جێبەکەمان بکەوێت، لەم بەرزاییە سەروژێری خوارەوەمـان دەکـات، هـەر چۆنێك بێت، هێدی هێـدی لـە بەرزاییەکـە نزیکبـووەوە و لـە گـەڵ گرانکردنـی گێـری جێبەکەی بەرەو هەورازی کەوتە رێ، لە ناوەندی بەرزایی ناوچە شاخاوییەکە، رووبەڕووی کۆمێك تاشەبەرد هات، کە جادە تەسکەکەیان بڕیبوو، ناچار ئۆتۆمبێلەکـەی وەسـتاند، لە جامەکانی چەپ و راسـت، بـە ترسـەوە تەماشـایەکی دەوروبـەری رێگاکـەی کـرد، شوێنێکی چڵکن و دڕ، کە تەسکی رێگاکەی ئالۆزترکردبۆوە،... ترسێکی گەورە لە دڵی نیشت، ماوەیەك بیری لە گەڕانەوە کردەوە، تەماشایەکی پشتەوەی کرد، لە بەر تەسکی رێگاکە، کە لە هەندی پارچەی دا، هەردوو تایـەکانی لای ئەفـەر، بـە ناسـتەم لێـواری بەرزاییەکەیان بەردەدا، بواری سـووڕانەوەی نـەبوو، نـشێوییەکەش یـەکجار رك و دژوار بوو، نەدەکرا بۆ پشتەوە ئوتومبێلەکە لێخوڕێت، ناچار بوو بەدوودڵی لە ئوتومبێلەکـەی دابەزێ، ئەو پاڵەوانەی بە درێژایی ژیانی بە یەك چاو مـان و نـەمانی هەڵدەسـەنگاندن، ئەو ساتە لە ترسی هەبوونی ورچ، خەریك بوو لە خۆی بچێت، شوێنێکی چـۆڵ و هـۆڵ و مەترسیدار، لە لایەك هاشەی هەوایەکی سارد لق و گەڵای درەختەکانی پێکدادەخـشاند، لە لایەکی تر، جریوە جریوی پەلـەوەڕان وخـشپە خـشپی گیانلەبـەرانی کێـوی، کـەش و هەوایەکی دڵتۆقێنەری دروستکردبوو، هەر کـە پێـی خـستە سـەر زەوی، مووچـرکێکی ترسناك لە بنی پێیەوەی سەرانسەر جەستەی داگرت و لە تەوقـەی سـەری دەرچـوو، بـە پەلە پەل بازیدایەوە ناو جێبەکە و دەرگاکەی داخستەوە، قسەی پلە نایـشی بیرهاتـەوە، کە هەر ئەو بەیانییە، بە پاڕانەوە پێی گوت: کوڕم بـە تـەنها ملـی ئـەو رێگاترسـناکە مەگرەبەر و کەسێکی تریش بکە هاوڕێت... خۆ لە راسـتیدا پـێش ئـەوەی لـە دێیەکـە ئاوابێت زۆر چاوی گێڕا بەڵکو کەسێکی کاروانیی دەستکەوێت، بەڵام پاش رووداوەکـەی شەوی رابوردوو، مەحاڵبوو پاڵەوانێك هەبێت، ئەگەر سەرەمەرگیشی بێت، لـەو رۆژانـە نەك هەر سەفەری شاربکات، بگرە نەدەبوایە تا هەڵچوونەوەکەی ئاغا نەنیشێتەوە، پـێ

له مەرگی خۆی بنێت و داوای مۆڵەتی چوونە شاریش بکات، ئەگەر نا، خۆ ئەو ئامادەبوو، نەك هەر بێ بەرامبەر دەیبرد ودەیهێنایەوە، بگرە خواردنەکەیشی بۆ دابین دەکرد، هەڵبەت نەدەکرا، مام مەجیدیش پلە ئایش بەتەنها لەماڵەوە بەجێبێڵێت، پاشان بۆ ئەوەی کاری بنیاتنانەوەی قوتابخانەکە، بە رێك و پێکی بەرێوە بچێت، دەبوایە ئەو و حاجی هەمزە، وەك دوو شارەزا لە دیار سەری پاڵەکان بووەستابان.

هەر چۆنێك بێت، ئەوەتا ئەو هەنگاوە نا ئەقڵانییەی هاوێشت و دەبێت چارەرێگایەك بۆ ئەو گرفتە دژوارە بدۆزێتەوە، ململانێیەکی توند و تیژ لە نێوان هەستەکانی ترس و شەرمیدا داگیرسا، پاش ماوەیەکی تری بیرکردنەوە، لەو تەنگاویە بێ چارەیەی،دەستی بۆ بن کوشنەکە برد و ئەو پارچە شیشەی دەرهێنا، کە مام مەجید بۆ کاتی تەنگانە بەردەوام لەو شوێنەی هەڵدەگرت، گوڕی هێنایەوە بەر خۆی و جارێکی تر بە دوودڵی دەرگاکەی کردەوە و دابەزی، یەکەمجار هەوڵیدا بێ ئاوڕدانەوە،لەتاشەبەردەکان نزیك بێتەوە و وەلایان نێت، بەڵام هەستێکی نامۆ ناچاری کرد ئاوڕێکی تر لە دەوروبەری بداتەوە، بە رارایی شیشەکەی خستە بن ملی و لە یەکێکیان داهاتەوە، کە ئاوەندی رێگاکەی گرتبوو، هەوڵیدا بە هەردوو دەست لای بدات و رێگاکە بکاتەوە، بەڵام یان بە هۆی قورسایی سەنگەکەی بوو، یان لە ترسان دەست و پێی لە جووڵە کەوتبوون، نیمچە کەورەکە لەشوێن خۆی نەبزوا، ویستی بگەرێتەوە ناو جێبەکە، بەڵام کتوپڕ لە گەڵ بیستنی دەنگێکی مەترسیدار لە شوێن خۆی چەقی و ئاوڕی دایەوە، دوو چەکداری ناناشنا وبەدچارە، کە دیاربوو خۆیان لە ناو دارستانە چڕگنەکەی سەرووی رێگاکە دانووساندبوو، لە پڕێکا بە دیارکەوتن و بە چاوتروکانێك خۆیان خشاندە خوارەوە و گەیشتنە سەر چەقی رێگاکە و بەرامبەری وەستان، یەکێکیان کورتە باڵایەکی بێ تووك و ئەویتریان زرتە زەڵام، بەرووگرژی بەرەوپیری هاتن، پێش ئەوەی قسە بکەن، لە رواڵەتیان دیار بوو کە کەسانێکی شەڕانین، بەڵام ئەو بە ناچاری، هەر کە لێی نزیك بوونەوە، بەرووگەشییەکی دەستکردە:

- باش بوو هاتن.
- .......
- من ماموّستا....
- پێویست ناکات خوّتمان پیّ بناسێنی، ئێمە باش دەتناسین.

لەگەڵ ئەو قسەیە، کە وەك هەورە تریشقەیەك کورتە باڵاکە بە شێوەیەکی بێنابڕوویی بە روویدا قیژانی، هەردووکیان بە یەکەوە بەتوندی چەکەکانیان سوارکرد و:

- شایەتمان بهێنە !

لە ترسان ، ئەوەندەی ئەما دڵی بە یەکجاری بوەستێت و نرخی گوللەکانیان بۆ پاشەکەوتکات، رەنگ زەردی رووخساری داپۆشی، بە دەنگێکی پچڕاو هاواری کرد:

- پەلە مەکەن... ئێوە هەڵەن... من هیچ نارێشەیەکم لەگەڵ...

پێڕانەگەیشت قسەکانی تەواو بکات، لە پرێکا، لە گەڵ تەقاندنی دوو گوللە، هەر هەموویان بە زریك و هۆڕەوە کەوتنە سەر جادە بەردەڵانەکە، نەك هەر دەنگی مرۆڤ، بگرە پاش خشپێنی فڕینە بە کۆمەڵی باڵندەکان و چاوەشارکێی دڕندەکان، هەر کە دەنگدانەوەی تەقەکان بەناو چیاکان تێپەڕی، بێدەنگیەکی رەها سەرانسەر دارستانەکەی داگرت و جڕوجانەوەرانیش دەنگیان لێ بڕا، پاشان لەگەڵ قاقای پێکەنینێکی شێتانە، جوتیار، کەمێك هاتەوە هۆش خۆی، لە سەرەتادا وای بۆ چوو، کە ئەوەشیان تەنها خەونێکە لەو رەشەخەونانەی ماوە ماوە لە نووستندا رایدەپەڕێنێت، بەڵام هەر کە بە دەروونێکی شکاوی و جەستەیەکی شەکەت سەیرێکی ئەم لاو ئەو لای کرد، لە جیاتی نامێزە گەرمەکەی پلە نایش، خۆی لە نێوان تەرمە خوێناوییەکانی هەردوو چەکدارەکە بینیوە، هەر گوڵلەیەك ناوەندی ناوچەوانی یەکێکیانی گرتبوو، بە گوێ زرنگانەوە لە شوێن خۆی راپەڕی و لێیان دوورکەوتەوە، بە شپرزەیی خەریك بوو بەرەو ناو جێبەکەی بازداتەوە، بەڵام هەر کە کابرایەکی دەماخ کردو لە ناو عارەبانەی جێبەکە بازی دایە خوارەوە و سەروسیمای خۆی ئاشکراکرد، ئەو لە شوێن خۆی مات و مەلول بۆوە.

عەولا کە دەمانچەیەکی بە دەستەوە بوو، بە کەمترخەمی لە تەرمەکان نزیك بۆوە، ماوەیەك لە دیار سەریان چەمایەوە، لە شوێنی لێدانەکان وردبۆوە، بە داخگرتوویی سەیرێکی ناوچاوانی کورتە بالاکەی کرد، کە گوللەکە بە ئەستەم بۆ سەرەوەی نێوان هەردووچاوانی هەلکشابوو،پڕ بە دەمی تفێکی لە دەم و چاوی کرد و بە تورەیی:

- دەمزانی ئەم گرگنە چلکنە بە کوشتنیشی هەر نارەحەتم دەکات، سەگی سەگباب، ئەگەر بالاکەی کەمێك درێژتر بووایە، نیشانەکەم دەقاودەق دەهێنا!!

ئەوەی گوت و هەر کە لە مردنیان دلنیابوو، یەك دوو فووی لە لولەی دەمانچەکەی کرد و بە شارەزایی گەراندیەوەی بەر پشتوێنی، بە کەمترخەمی بەرەو تاشەبەردەکان هەنگاوی نا و هەر بەرێوە و بێ ئاوڕدانەوە وەك سووکایەتی پێکردنێك:

- من تەنها دوو گوللەم وەشاند، کەچی تۆش لەگەلیان کەوتی؟

لە گەل ئەو قسەیە، جوتیار بە ترس و لەرزەوە، سەرتاپای جەستەی پشکنی، هەر کە لە سەلامەتی لاشەی دلنیابوو، بە رووخسارێکی زەردهەلگەڕاو و بە نیمچە چەواشەیی:

- ئەمانە کێ بوون؟!... ئەو گوللانە هیچیان نەیگرتم؟!... ئەی تۆ چۆن گەیشتیە ئێرە؟!

عەولا وەلامی نەدایەوە، بەردەوام بوو لە سەر لادانی پارچە کەورەکان وکردنەوەی رێگاکە، جوتیار بە شەرمەزاری رووی لە عەولا گۆڕی، لە تەرمەکان نزیك بۆوە،پارچە تفەنگێکی هەلگرت، پاش ماوەیەك بێدەنگی و بیرکردنەوە، رووی تفەنگەکەی کردە عەولا و:

- وام زانی ئەوان تەقەیان لێکردم !

هەر کە عەولا بۆ وەلامدانەوە، ئاوڕێی لێ دایەوە، بە حەپەساوی:

- ئاگاداربە، تفەنگەکە سوارە وگوللەی لەبەرە !!

ماوەیەك سێرەی لە ناوچاوانی گرت و پەنجەی لەسەرپەلەپیتکەی تفەنگەکە هەلنەگرت، لە ژێر کاریگەری رووداوەکە بە یەکجاری شپرزە ببوو، لەو کاتەی عەولا

بەسەرسامی، بەرامبەری وەستابوو و خۆی نەدەبزواند، ئەو هەر جار رووی تفەنگەکەی بۆ شوێنێکی تری جەستە زەبەلاحەکەی دەگواستەوە، جاربەجار نیشانەی لە نێوان هەردوو چاوە تیژەکانی دەگرت، جار جاریش لولەی تفەنگەکەی بۆ سەر دڵە رەق و بێ بەزەییەکەی شۆڕدەکردەوە، هەندی جاریش بە شەرمەوە، سێرەی لە ناوەندی دامانە بۆگەنەکەی دەگرتەوە، ئیتر بەو شێوەیە، ماوەیەك رایدەگرت و پاشان بۆ شوێنێکی تری دەیگوازتەوە، ماوەیەکی زۆری خایاند، پەنجەی سەر پەلەپیتکەکە نەبزوا، هەستێکی شاراوە نەیدەهێشت پەنجەی بگوشێت،چاوانی پڕ فرمێسك بوونەوە، زۆر هەوڵی دا گورێك بهێنێتە بەر خۆیی و پەنجەکەی داگرێت، بەڵام دیسان هەمان هێزە شاراوەکە زاڵبوەوە، هەردوو دەستەکانی لەرزین، چەکەکە کەوتە خوارەوە، عەولاش کە تا ئەو کاتە، بە دڵراوەکێ لە شوێن خۆی چەقیبوو، هەناسەیەکی گەرمی هەڵکێشا، ئەوەك جوتیار ژیوان بێتەوە، خێرا پەلاماری تفەنگەکانی دا و لە گەڵ زەخیرەکانی هەڵگرتنەوە، بە لێزانین هەمووی لە ناو هەردوو پشتێنی کوژراوەکانی پێچانەوە و ناودیوی ناو عارەبانەی جێبەکەی کردن و ئینجا گەڕایەوە لای لاشەی کوژراوەکان و بە پێکەنینێکی شێتانە هەر بە پێ هەردووکیانی بەرەو لێواری بەرزاییەکە گلۆرکرد و بەرەو خوارەوەی فڕێدان، پاشان بە نەرم و نیانی رووی کردەوە جوتیار و:

- خێراکە مامۆستا، با لێرە بچین.

وەك گیانلەبەرێك تازە لە جیهانی مردووەکان گەڕابێتەوە، جوتیار رووخساری بەیەکجاری بەزەردی هەڵگەڕابوو، بە حەپەساوی سواری جێبەکەی بوو و بەخێرایی لێیخوڕی، عەولاش کە هەرچەندە هێشتا لە ژێر کاریگەری ئەو هەڵوێستە سەیرە حەپەساوی بوو، بەڵام هەرکە لە سەر لێواری ئەو بەرزاییە ترسناکە، سەری خۆی لە جامەکەی تەنیشتی بردە دەر و تەماشایەکی سەرنشیوە ترسناکەکەی خوارەوەی کرد، ترسێکی گەورەی لێنیشت و بە دەنگێکی بەرز:

- لە سەر خۆبە، هیچ مەترسییەك لەئارادا نەما.

پێش ئـەوەی ناوچـە شـاخاوییەکە بـەجێبێڵن، لـە سـەر داوای عـەولا لـە تەنیـشت هەورازییەکی سەخت راوەستان، عەولا بەخێرایی تفەنگەکانی هێنایە خوار، نەختێك بـە شاخە درِ و چلکنەکە هەلکشا و لە جادەکە دوورکەوتەوە، پاش ماوەیەك بەدەست بەتالی و بە هەناسەسواری گەڕایەوە ناو جێبەکـە، جوتیـار تـا ئـەو کاتـەش هـەر نـوقمی نـاو لێکدانەوە سەرسوڕمانەکانی بوو، لە نێوان خەون و راستیدا واقـی و وڕمـابوو، تـا ئـەو کاتەش نەیدەتوانی وێنای ئەو هەلوێستە چاوڕواننەکراوە بکات، هەر کە گەیشتنە جـادە قیرەکە و ئوتومبێلی تری بینی و روویان کەوتە شار، بێ ئاوڕدانەوە و لەسەرخۆ:

- هیچ تێنەگەیشتم، ئەم دوو چەتەیە چی بوون؟! پاشان تۆ چۆن پەیدابووی؟

وا دیار بوو، عـەولا چاوڕوانی ئەو پرسیارەی دەکـرد و وەلامـەکـەی نامـادە کردبـوو، نەوەك زەنگی بێدەنگییەکە لێبدرێتەوە، خێرا:

- بۆسەی ئاغا بوو بۆ لە ناوبردنـت، بـەلام شانـست هـەبوو کـە منـیش شـەوی رابوردوو، فەرمانی کوشتنم دەرچوو، ناچار خۆم لەناو عارەبانەی جێبەکەت حەشاردا.

ئەو شەو پاش چۆلبوونی دیوەخان، عەولا لە خۆشـییا خـەو نـەیتوانیبوو پێلوکـانی دابەزێنێ و چـاوانی داپۆشـێت، هـەرجارێك بـۆ سـەر تەنیـشتێکی خـۆی دەگەوزانـد و چاوەکانی دەنووقاند، دەیویست نوقمی ناو خەونە خۆشـەکانی ببێـت، بـەلام دالغـە بـێ سەروبەرەکانی قووتیان دەدا، یەکەمجاری بوو، بە فەرمانی ئاغا بەردەرگاکە بـەجێبێلێت، وەك کەسێکی ماقوول و خانەدان مامەلەی لە گەل بکرێـت و لـە سـەرووی دیوەخانەکـە دابنیشێنرێت، ئەو جۆرە مامەلەیە، دانپێدانانێك بـوو، ئـەوی لـە پـێش چـاوی دۆسـت ونـەیاران گـەورەتر کـرد، هـەر چـەندە ئـەو هـەنگاوە رالێبینـراوە بـە بۆچـوونی ئـەو رنگدانەوەیەکی راسـتەقینەی توانـا و لێهـاتوویی ئـەو بـوون، دەبوایـە زۆر لـە مێـژان بهاوێژترایە و رێز لە خزمەتە بێ سنوورەکانی بگرترایە، بەلام هەر قەیناکـە، خـۆو لـە شوێن و کاتێکی ئەووتۆش راگەیاندرا، کە هەموو کەم و کورتیەکانی قـەرەبوو کـردەوە، بەشێوەیەك راگەیاندرا کە دەمارەکانی لە خۆبایی بەیـەکجاری پڕتـر و گـەورەتر بکـات،

ئیتر ئەو شەو لە خۆشییا خەوی زڕابوو، ناچار لە شوێن خۆی هەستایەوە، لـە گـەڵ دوو بتڵی شەرابی ئاغا، چوارمشقی بەرامبەر سۆپاکە دانیشتەوە و بە یەك ئاگر هەم سۆپاکە و هەم جگارەیەکی داگیرساند و کەوتە خۆدوواندن: هێ هێ، بەخوای کەری عەولاّ، هێ هێ، ئەوەتا بۆ یەك چاوتروکان لـە ریـزی پیـاوان دانیـشتی، کەچـی وەك نەدیتکـە لـە خۆشییا خەوت لێ زڕا، چەندین ساڵە لەم ژووره پان و بەرینە، بەتەنیایی، بێکەس وکار، بێ ژن و ماڵ دەژیت، شەو و رۆژ، وەك سەگ لەبەر ئەم دەرگایە وەسـتاویت و چـاوەڕێی فەرمانێکی تر دەکەیت، هەرگیز بیرت لە خۆ نەکردەوە، ئاخر کەی تـۆش دەبیـە خـاوەن خێزانی خۆت؟ تۆ چیت لەو خەڵکە کەمترە؟ ها، کەمتری چی؟! منیش ئاغام و هیچم لە ئەو کەمتر نییە، ئەو بە من گەورەیە، گەر ترسی مـن نەبێ، خەڵك بەژەمێك دەیهەنجێنن و مێشکی دەپلیشێنن!! هێ هێ، بەڵام ئەو هەر ئاغایـە و تـۆش خـولاّم !! هـا، باشـە ناکرێت منیش ببمە ئاغا و دەسـەڵاتم بـە سـەر هـەموویان بـچەسپێنم؟ مەگـەر ئاغـا بکوژیت و؟! نا نا، بەخوای مانەوەم بەمانەوی ئەو سەگبابە بەستراوە، گـەر ئـەو نـەبێ، ئەم رووت و قووتانە پارچە پارچەم دەکەن، پاشان مرۆڤ نابێ بێنـان و نەمـەك بـێ، مـن دەستکردەی ئەو جوامێرەمـە و کەسـێك زۆڵ نـەبێت بـەرد ناگرێتـە کانیاوەکـەی، ئـەو بەخێوی کردووم، من وەك کوڕی ئەوم، خۆ ئاغاش هەر کچێکی هەیە، دووریـش مـەگرە بیداتە من، ئای باوکە رۆ نازدار !! چ ناسك و نازداری؟! هەی قوربانت بم، خۆزگە بەس یەك شەو، وەك چەپکە نێرگزێك یان دەستکە ریحانێـك هەڵمـژیبوای، ئەوسـا سـەد جـار گەردەنی عزرائیلم ئازاد دەکرد، ئەی هاوارە خوایە، ئەو چاو و برۆیە، ئەو بەژن و باڵایە، ئەو قژە زەردە، ئەو ئێسك سووك و دڵبەرە، ئەوشۆخ و شەنگە شێتی کـردم و.......) لـە گەڵ خواردنەوە و خولیای ئەو ئارەزووە شـێتانەیەی، پـەیتا پـەیتا دامانەکـەی گـەرمتر دەبوو، دەمارە گورگاوییەکەی لە ناو پڕکرد و بەرەو لوتکەی سەرگەرمی هەڵیکێشا، بـە دەست خۆی نەبوو، لغاوی دڵ و هۆشی کەوتە دەست دامانـە سـوتێنراوەکەی، هەڵبـەت گەرمی دامانیش بێ دامانێکی تر فێنکـی نابێتـەوە، لغاوەکـەی بـەرەو ژووری نـازدار

رایکێشا، بە هێمنی دەرگاکـەی کـردەوە، لـە ژێـر قاچـەکانیدا، لـە سـەر ئـەژنووکانی دانیشت، نازدار لەگەڵ هەناسەیەکی نەرم وگەرم باوشی لە خەو گرتبوو، لەبـەر روونـاکی چراکە، سەنتیم سەنتیم لەو تابلۆیە بێهۆشکەرە وردبۆوە، بگرە لە پەنجـەکانی پێـی و بـۆ سەرەوە، چۆکەکانی، رانە سپی و نەرم و نۆڵەکانی، زراوی ناو قەدەکەی، ئـەو سـینگ و مەمکەی لە دوو گومبەت دەچوون، گەردەنەخەیاڵیاویەکەی، روومەت و چاو و برۆکانی، ئەو قژە زەردەی کە تەڵ تەڵ لە گەڵ ئاسماندا دەجەنگان، خۆی قوربانی کام پارچـەی ئـەو جەستە پیرۆزە بکات؟! چۆن بەرامبـەر تینـی ئـەو روناکییـە نەتاوێتـەوە؟ هێـور هێـور کەپووی لە قاچـەکانی نزیـك کـردەوە، هەناسـەیەکی درێـژی لێ هەڵکێـشا و بۆنەکـەی هەڵمژیە قووڵایی ناخیەوەی، ئاگری دامانی زیاتر داگیرسا، سەرەتا بەلێوە رەشەکانی، بە هێمنی یەکە یەکەی پەنجەکانی مژین و ماچ کرد، زمانی لەسەر قاچـی راسـتەی دانـا و بەرەو سـەرەوەی خشاند، بە کەپووە رەش وپانەکەی هێواش هێـواش دامـانی کراسـەکەی هەڵدایەوە و بەرەو ناو دامانی هەڵکشا، خەریك بوو بە یەکجاری لە هۆش خۆی بـچێت، بەڵام لە پڕێکا نـازدار هـەر وەك چـۆن نێـچیرێك لـە دەمـی ئەژدەهایـەك دابڕسـێتەوە، رایکالاند و بە فڕین بەرەو دەرگاکە راپەڕی و هاواری کرد، لە گەڵ دەنگی قیژاندنەکـە، ئاغا و ئاغاژن بە نیمچە رووت و قووتی دەست بـەجێ گەیـشتنە ژوورەکـە، نـازدار بـە شپرزەیی خۆی لە ئامێزی دایکی دا، ئاغاش هەر کە عەولای لـەو ژوورە بینـی، پلـەی بەستنی خوێنی بەرز بۆوە، چاوەکانی وەك پەڵی ئاگر سوور هەڵگـەڕان و بەهەڵـچوونەوە پـەلاماری قـوڕگی دا، ئـەویش لـە ژێـر کاریگـەری ترسـی پـچڕانی هەناسـەکانی، سەرخۆشییەکەی بوورایەوە و هۆشی هاتەوە بـەر، ناچـاربوو دەسـتەهەڵێنێ و رووبـەڕووی مان و نەمانی بێتەوە،پاش ململانێیەکی سـەخت، توانی خۆی لە دەستە چرچەکانی رزگار کات، دەیزانی ئیتر کار لە کارا ترازا، پێش ئەوەی دەستەی جـەردە بگەنـە شـوێنەکە و پارچە پارچەی بکەن، وەك بروسك بە سێبازی خۆی هاوێشت، لەگەڵ بیستنی بانگـەوازی ئاغا و قرچە قرچـەی سـوارکردنی تفـەنگی خولامـەکان، رۆحـی خـەریك بـوو جەسـتە

بۆگەنەکەی بەجێ بێڵێت و پێشی کەوێ، هەستی دەکرد کە تەنها بستێك لێـی دوورن و هەر ئێستا ها دەیگرن و وەك بەرخی نێر سەری دەبڕن، نەك هەر بە دەست و پێ، بگـرە بە تەقڵەلێدان و تلبوونەوە، لە سەر نشیووەکە گلۆربوٚوە و بەرەو ناو ماڵەکان بـازی دا، هەر کە گەیشتە بەرامبەر ماڵی جوتیار، خۆی هەڵدایـە نـاو عارەبانـەی جێبەکـە و بـە هەزار ترس و لەرزەوە، لە سەر سك لە ژێر پارچە خیوەتە کۆنەکە، خۆی شاردەوە.

هەر کە گەیشتنە شار، بەرامبەر چایخانەکەی سمۆ کە دەکەوتە لاگۆشەی راستی دەروازەی کۆلانی پەرتووکخانەکان، جێبەکەیان راگرت، پێکەوە دابەزین و بۆ دوکانی هەژار رۆیشتن، کە بریتی بوو لە لێکدانی دوو دوکان و چەند هەنگاوێك دووری چایخانەکە بوو، ئەویش هەر کە چاوی پێیان کەوت، بە گەرمی بە پیریانەوە چوو و بەخێرهاتنیانی کرد، هاوەڵەکەی لە شوێن خۆی دانیشاند، ویستی تەختەکەی تریش بۆ هاوەڵە نەناسەکەی دابنێت، بەڵام ئەو بە بەهانەی خۆشکردنی دەستاوێك بۆ مزگەوتەکەی ناوە بازار موڵەتی وەرگرت.

هەر بە پێوە، هەژار بۆ تاخمە چایەك بانگێکی هەڵدا، ئینجا بە روویەکی خۆشەوە بەرامبەری دانیشت، لە گەڵ پێشکەشکردنی جگارەیەك، جارێکی تر دەستی لە سەر ملی دانا وپرسیاری مام مەجید و پلە نایشی لێکرد، لەو کاتە سمۆ چایەکەی هێنا وهەر کە چاوی بە میوانەکە کەوت، خەریك بوو لە خۆشییا پیاڵەکانی دەستی بەرداتەوە، بە گەرمی تەوقەی لە گەڵ کرد، ماوەیەك بە رووخۆشی لە دیار سەری وەستا و هەر بە پێوە چاك و چۆنییەکی گەرمی لێکرد، بەڵام هەر کە بێدەنگی جوتیار درێژەی خایاند، هەردووکیان بەترسەوە سەیرێکی سەروسیما پەشیوەکەیان کرد و هەژار لە سەرخۆ:

- بێتاقەت دیاری؟!
- ئەوەی لە گەڵدا عەولاَ بوو !!
- هەمووتان بە خێربێن و........

لە پرێکا بە حەپەساوییەوە، دەمی داپچڕا، خۆنەویستە رووی کەوتە سمۆ، کە ئەویش هەروا بە هەمان شێوە، لە گەڵ بیستنی ئەو ناوە ترسناکە، وەك پەیکەرێکی بەردین لە شوێن خۆی چەقیبوو و سێرەی لە هەژار گرتبوو، هەردووکیان ماوەیەك بە تێکڕامان

کەوتنە یەکتردواندن، پاشان هەر پێکەوە بە واق ورماوی چاویان تێبڕیوە و هەرپێکەوەش:

- کام عەولآ؟!

- ئەمرۆ لە سەر لێوارێکی سەختی مەرگدا دەربازی کردم و........

لەو کاتە سمۆ مۆڵەتی وەچانێکی کورتخایەنی لە وەستاکەی وەرگرت وگەڕایەوە لایان، جوتیاریش بێ پچڕاندنی قسەکانی، هەر لە سەرەتاوە رووداوەکەی بۆیان باسکردەوە، پاشان بە قورگێکی گیراوە، رووی کردە هەردووکیان و وەك پاڕانەوە، گوتی:

- ئێستا زۆر بێ تاقەتم، پێویستم بە حەسانەوەیەك هەیە، ئەم شەو لای خۆتان بیحەوێننەوە تا ڕێگاچارەیەکی تری بۆ دەدۆزمەوە.

لەگەڵ ئەو قسەیە، هەردووکیان لەشوێن خۆیان راچڵەکین، هەژار بەرووخسارێکی تۆقێنراو:

- چی؟!... من و ئەو درندە چەکدارە لە یەك ژوور؟!

- کەواتە من دەیبەمە لای خۆم، بە هیچ شێوەیەك ناهێڵم لێم دووركەوێت !

هەژار هەرچەندە جگارەکەی لە دەستبوو، کەچی ئەوەی دەستی جوتیاریشی لێ وەرگرتەوە و هەردووکیانی پێکەوە بۆ دەمی برد، لە گەڵ تریقەی پێکەنینی سمۆ بە ناگاهاتەوە، بەشەرمەزاری ئەوەکەی ئەوی بۆ گەڕاندەوە، دووسێ مژی درێژی لە جگارەکەی دا وپاشان بەگرژی رووی کردەوە سمۆ بەڵکو فریای کەوێت، ئەو بەسەزمانەش هەر چەندە شەش مانگ زیاتر نەبوو، تێکەڵی ئەو هەردوو هاوەڵەی ببوو، بەڵام شەو نەبوو چ لەماڵی یەکێکیان، یانیش لە مەیخانە، کاتێك ئەو تەنها بە مەبەستی مزە و خواردنەکە یاوەریان دەبوو و لە خواردنەوەش دوژمن بوو، گوێبیستی ئەو بەسەرهاتە دڵتەزێنە نەبێت، کە زۆر جار جوتیار بە سەرگەرمی لە گەڵ فرکردنی پێکەکانی، کارەساتەکەی باسدەکردەوە، ماوە ماوەش گریانێکی سەختی بەردەدا و ئیتر ئەوانیش لە دڵسۆزی خۆیانەوە دەستیان بەگریانێکی جەرگبڕ دەکرد، نەك هەر ئەوان، بگرە جارێکیان

بۆ پاڵپشتی لە گریانەکەیان، تێکڕای دانیشتووانی مەیخانەکە، بێ ئەوەی لە مەسەلەکەش حاڵی بن، هەر کەس لە لای خۆیەوە، بە مەستی دەستیان بە هات و هاوارێکی شێتانە کرد، هەر یەك لە شوێنی خۆی، بگرە مام میخۆش، گریانێکی ئەوتۆی بەردەدا کە لە گەڵ ئێش و نازاری یادگاریە تاڵ و خۆشەکانی ناخیەوە گونجاو بێت. سمۆ هەر چەندە مرۆڤێکی دوورەبەلاش بوو و دەیویست ژیانێکی نارام بباتە سەر، کەچی لەو جۆرە دانیشتنانە، کە لە دەستەی سوێندخۆران دەچوون، سەرەڕای ئەوەی کە نەیدەخواردەوەش، بەلام لە ژێر کاریگەری دڵتەزێنی کارەساتەکە، عەولا وەك مرۆڤێکی ئێسك قورس لە مێشکی وێناکرابوو، ئەگەر هەرکاتێك ئەو هەلەی بۆ رەخسابوایە و رووبەڕووی ئەو دەعبایە ببوایەوە، ئەوە بێ یەك و دوو پەلاماری دەدا وپەنجەکانی لە ناو دڵ و هەناوە رەش و بۆگەنەکانی دەچەقاند، نەك هەر ئەو، بگرە هەژار لە تەمەنی منداڵی خۆیشی دا، لە ترسی شەڕکردن تێکەڵی منداڵانی گەڕەکەکەی نەدەبوو، کەچی بۆ تۆڵەسەندنەوەی جوتیار لە هەموویان گەرم و گوڕتر بوو، بەلام وادیاربوو کە گەرم و گوڕی هەموویان تەنها لە کاتی خواردنەوەدا بە دی دەکرا، چونکە ئەو رۆژە دەست و پێیان لە ترسان بە تەواوی لە جووڵە کەوت... سمۆ بە واقی وڕماوەوە رووی کردەوە جوتیار و:

- ئەمشەو تۆش لەگەڵمان بێیت باشترە !

لەگەڵ ئەو پێشنیارە، سەری عەولا بە دیارکەوت، وەك تەقینەوەی بومبایەك هەموویان لە شوێن خۆیان بێ دەنگ بوون. جل و بەرگی جارانی گۆڕی بوو، لە جیاتی کورتەك و سەرواڵەکەی، چاکەت و پانتۆڵێکی گران بەهای پۆشی بوو، لە جیاتی سەرپێچەکەی سەریشی شەبقەیەکی خستبووە سەر، ئەگەر سمێڵە بۆرەکانی نەبوایە، کە زیاتر لە هەر پارچەیەکی جەستەی سەرنجراکێشتر بوو، لەوانەیە بەو دەمامك پۆشینە لە سەر جوتیاریش تێپەڕی بوایە، هەژار هەر کە چاوی پێکەوت، بە شپرزەیی شوێنەکەی خۆی بۆ بەجێهێشت و ئەویش دانیشت وپیالەچایەکەی پێش هەژاری بەدەستەوە گرت،

ماوەیەك بە حەپەساوی چاوی بڕیە كتێبەكان، بە وردی ئاوڕی لە دەوروبەری خۆی دایەوە، بە یەك قووم چایە ساردەكەی فڕكرد، بە مەندەهۆشی لە شوێن خۆی هەستایەوە و لە ڕەفەكان نزیك بۆوە، بە پەرۆشەوە كتێبێكی كێشایە دەرەوە و ماوەیەك لاپەڕەكانی هەڵداوە و ئینجا گەڕاندیەوە شوێنی خۆی و یەكێكی تری دەرهێنا و بە هەمان شێوە ڕوانییە هەندێك لاپەڕەكان و پاشان ئەویشی گەڕاندەوە شوێنی جارانی، بە واق و وڕماوی سەیرێكی هەژاری كرد و:

- تۆ ئەم هەموو كتێبانەت خوێندونەتەوە؟
- نەخێر، بەڵام زۆریانم خوێندونەتەوە.
- ئینجا باسی چی دەكەن؟
- هەمە ڕەنگن، هەندێكیان مێژووین، هزرین، زانستین، ڕۆمانن....هتد.
- ڕۆمان چییە؟!
- ها !! ئا، دەكرێت بڵێین: دەربڕینی هزرێك لە میانی گێڕانەوەی بەسەرهاتێكی دانراو یان دەستكاری كراو.

عەولا بەناوچاوانێكی گرژ و ساویلكانە، ماوەیەك كەللەی سەری خۆی خوراند و:

- گوتت چی؟!
- ها... دەكرێت بڵێین چیرۆكێكی درێژ !

ئەوەك لەو كات و ساتە ناوەختە، درێژە بە پرسیارەكانی بدات و ئارەحەتری بكات، هەژار لە گەڵ ئەو وەڵامە یەكسەر ڕووی كردە سەوز و:

- ئا سەوز چایەكی تری بۆ بێنە، ئەمەیانی ساردبوو، یانیش هەر بیكە تاخمیەكی تەواو.

بەڵام عەولا هەر سووربوو لە سەر وەڵامێكی بنبڕ و یەكلاكەرەوە، بێ مۆڵەت وەرگرتن، جگارەیەكی لە پاكەتەكەی هەژار دەرهێنا، كە لە سەر تەختەدارەكەی بەرامبەریان دانرابوو و دایگیرساند و:

- بەڵام چ مانایەك دەدەن، هەموویان باسی چی دەكەن؟!

لە خۆشبەختی هەژار، لە گەڵ ئەو پرسیارە ئاڵۆزە، یەكسەر دەنگێكی ژنانە بە هیلاكی وەڵامی پرسیارەكەی دایەوە و:

- من دزانم هەموویان باسی چی دەكەن!!

لە گەڵ ئەو دەنگە، ئافرەتێكی نیمچە بە ساڵاچوو، بە پۆشاكێكی ناوازە شێوەگەلی سۆفیگەرێتی، تەزبیێحێكی درێژ و دەنك گەورەی لە ملی ئاڵاندبوو، هەر لە سەر زەوی رووەو عەوڵا دانیشت و بە شێوەی سوالكردن دەستێكی پانكراوەی بۆ درێژكرد و:

- هەموویان وسەد ئەوەندەی تریش بخوێننەوە...یەك مانا دەدەن... هەموویان دەڵێن باشە بكە و بەدكار مەبە !! تۆش خێراكە شتێك ببەخشە و با ئایندە و داهاتت بۆ بخوێنمەوە.

عەوڵا لە گەڵ بەردانی زەردەخەنەیەك، زقەی لە چاوە شینەكانی گرتەوە و برێك پارەی لە گیرفانی دەرهێناو بێ ژماردن پێشكەشی كرد و:

- تۆ ناوت چییە پیرەژن؟

- ئینجا كەس هەیە لەم دونیایە، پیرە سارای فاڵچی نەناسێت؟!

سارا یان پیرە سارا یان هەر وەك چۆن هەر سێ هاوەڵەكان بۆ خوێندنەوەیەكی بە خۆرایی ناو لەپەكانیان بە پلە سارە بانگیان دەكرد، لە رێگای فاڵگرتنەوە گوزەری دەكرد و دەستكەوتی رۆژانەی بۆ بژێوی خۆی دابین دەكرد، هەرچەندە تەمەنی شەستەكانی تێپەڕاندبوو و رۆژگار تا رادەیەك روومەتەكانی چرچ و لۆچ كردبوون، كەچی هێشتا نهێنییەكی شاراوە لە قووڵایی چاوە شینەكانی دەبریسكایەوە و شایەتانی ئەوەی بۆ دەدا كە هێشتا بە یەكجاری تافی گەنجێتیی لە دەستنەداوە و هەوەسی مێینیەكەی بە یەكجاری دانەمركاوەتەوە. لە گەڵ دوا وەڵامی سارا، جوتیار كە جارجار بە نیگادزە سەیری دەكرد، لە شوێن خۆی هەستایەوە و لە كتێبەكان نزیك بۆوە، ژمارەیەكی هەڵبژارد و رووی كردە هەژار:

- درەنگە با شوێنەکە داخەین و میوانی مام میخۆ بین.

ئەمەی گوت و ویستی دەرکەوێ، عەولاّ دەستبەجێ پەلاماری کتێبەکانی دەستی دا و خستیە بن ملی و بەدوای کەوت و هەر بە ڕێدا ئاوڕێکی لە پیرە سار دایەوە و بە سەرلەقاندن:

- بە داخەوە پیرێ ناوەخت هاتیت، بەلاّم خەمت نەبێت یەکدی دەبینینەوە!!

ئەمەی گوت و بێ پچراندنی قسەکانی ڕووی کردە جوتیار و:

- ئەرێ مامۆستا ئەم کتێبانە هیچێکیان چیرۆکن؟

- .........

لە وەلاّم نەدانەوەکە، عەولاّ وای بۆچوو کە هیچێکیان چیرۆك نین، بۆیە خێرا پێش ئەوەی دەرابەی دوکانەکە شۆڕبکرێتەوە، ڕووی کردەوە هەژار و بە تامەزرۆیی:

- دەمەوێت چیرۆکێك بکڕم !!

ئەوەی گوت و دەستی بۆ گیرفانی برد و جزدانەکەی دەرهێنا، هەژاریش بە مەندەهۆشی سەیرێکی جوتیار و سەۆی کرد و بە دوودڵی گەڕایەوە ناو دوکانەکە و کۆنە کتێبێکی سەر ڕەفەکانی هەلگرت و دایە دەست عەولاّ و:

- پارەکەی هیچ نییە.

- کەواتە بە دەستخەتی خۆت دیارییەکەت بنووسەوە.

بە گەرمی کتێبەکەی بۆ گەڕاندەوە، هەژاریش بە لاچاوێك سەیرێکی هەردوو هاوەڵەکانی کرد و بە ناچاری پێنووسەکەی دەرهێنا و:

- ناوی باوکت چییە؟!

لە گەڵ ئەو پرسیارە، خەمێکی قووڵ ڕووخساری عەولاّی داگرت و ماوەیەك بێدەنگ بوو، پاشان بە شێوەی گاڵتەبازییەوە:

- من وەك حەزرەتی عیسا بێ باوکم، بنووسە عەولاّ سەگ.

پیرە سارا کە لە گەڵ هاتنە دەرەوەی خەریکی ژماردنی ئەو برە پارەیەی بوو کە ئەو مەردەپیاوە بێ بەرامبەر پێی بەخشی، ئەوەك لە دەستی بدات، بە دڵاچوون:

- ئینجا کێ لە ناوی باوکی راستەقینەی یان لە ئەلقەکانی زنجیرەی رەسەنایەتی باوو پیرانی دڵنیایە، گرنگ ناوی دایکە تا فاڵەکەت بۆ بگرمەوە!!

لە گەڵ ئەو ئاخافتنە، عەولا جارێکیتر ماوەیەك بە رووخۆشی لە چاوە شینەکانی وردبۆوە و:

- پەلە مەکە لە گرتنەوە، کە یەکدیمان بینیەوە، هەموو شتێکت بۆ ئاشکرا دەکەم!!

لە سەر داوای جوتیار، کتێبەکانی خستە ناو جیێبەکە، ئوتومبێلەکەیان لە شوێن خۆی جیهێشت و پیادە بۆ ناو بازارەکە سەرکەوتن، ئەوان هەرسێکیان لە پێشەوە دەچوون، پێکەوە بە چرپە چرپ یەکتریان دەدواند، عەولاش بە ساوێلکەیی لادێکان هەر کە چاوی بە کەل وپەلێکی نوێ دەکەوت، ماوەیەك بەرامبەر دوکانەکە دەوەستا و لە گەڵ خاوەنەکەی دەدوا و پاشان بە دەست بەتالی تێدەپەری، چەندین جار هەرسێکیان ناچار دەبوون تاکو لێیان دانەبرێت و دوورنەکەوێت، لە شوێن خۆیان دەوەستان، لە چێشتخانەکەی ناو بازار نانی نیوەرۆیەکی درەنگیان خوارد، بۆ خواردنەوەی چایەکەش چوونە ئەو دارتاشخانەیەی کە لە رێگای دروستکردن و چاککردنەوەی رەفەکانی پەرتووکخانەکە، هەژار لە گەڵ خاوەنەکەی ناسیاوییەکی باشی هەبوو، لە گەڵ خواردنەوەی چایەکان و داگیرساندنی جگارەکانیان، لە سەر داخوازی هەژار، دارتاشەکە بە سەرسامی چوار پارچە داری ئامادەکرد، دوو کاریتەی دوو مەتری لە گەڵ دوو دەپەی ئەستوور کە درێژی هەر یەکێکیان مەتر و نیوێك دەبوو لە گەڵ ژمارەیەك بزمار و سنگ، عەولاش لە سەر داخوازی جوتیار کەرستەکانی گواستەوە ناو جیێبەکە، ئێوارەیەکی درەنگ، هەر چواریان ملی مەیخانەیان گرتە بەر، مام میخۆ لە گۆشەیەکی ئارام و دڵگەرەوە مێزێکی بۆیان رازاندەوە و بە گەرمی:

- مام مەجید لە گەڵتان نییە؟!
- نەخێر ئەمجارە عەولاّمان لە گەڵدایە !!

جوتیار بەو جۆرە وەڵامی مام میخۆی دایەوە، عەولاّش کە هەر چەندە یەکەمجاری نەبوو سەردانی مەیخانەکان بکات و بە دەیان جار لە گەڵ ئاغاکەی ئەو جۆرە کەش و هەوایەی بۆنکردبوو، بەڵام سەرەڕای ئەمەش، هەر بە واقی وڕماو لە جەنجاڵی هەر چواردەوری هۆڵە پان و بەرینەکە وردبۆوە و:

- سەیرە، دەچیتە مزگەوت، وادەزانی موسلمانەکان هەموویان هەر لە نوێژن، کە دێیتە ئێرەش ئەم هەموو قەرەباڵغیە دەبینی، وادەزانی هەموویان لێرەن !! وادیارە ئیشتان باشە مام میخۆ؟
- ئینجا بۆ نایەی لە گەڵمان ئیوەیی بکەین؟
- ئاخر شەریعەتی ئێمە رێنادات !
- ئینجا شەریعەتی تۆ کەی رێیداوە بیخۆیتەوە؟

عەولاّ دیار بوو لە گەڵ ئەو گاڵتە وەڵامە، کەمێك ناڕەحەت بوو، ماوەیەك بە گرژی چاوی بڕیە مام میخۆ، کە بە خەندەیەکی گومڕا، لە دیار سەری چاوەڕێی وەڵامەکەی دەکرد، تاکو بە پرسیارێکی ئالۆزتر سەرقاڵتری بکات، بەڵام ئەو پاش کەمێك بیرکردنەوە، رووی کردەوە سەر مێزەکە، بە پەرۆشی پەلاماری بتڵە ئارەقەکەی دا و هەموو پەرداخەکانی پڕ کردن وپێکەوە بە نۆشی یەکدی خواردیانەوە، هەژار پاش خواردنەوەی پێکی دووەمی، دیاربوو کەمێك ترس و دڵڕاوەکێی هێورتر ببوو، بە رووخسارێکی کەمترخەم رووی کردە سمۆ و:

- کاکە تۆ دەتوانی بچیت و کارەکانت جێبەجێ بکەیت.

لە گەڵ ئەو قسەیە،جوتیاریش بنی پێکی دووەمی هێنا، بە هێمنی سویچی جێبەکەی بۆ تێهەڵدا و بە خەمۆکی:

- لە سەرخۆبە، ئێمە تا درەنگ دەمێنین.

سمۆ کە بەردەوام چاوێکی بە عەولاوە بوو،، هەر بە پێوەش لە گەڵ خواردنی کەوچکێکی تری جاجیکەکە و هەلگرتنی پشکە گۆشتێکی تر، بە نیگادزە سەیرێکی تری عەولای کردەوە وبە پەشۆکاوی دەرکەوت، هەژار یەك دوو کەوچکی جاجیکەکەی خوارد و قومێکی بچووکی لە پەرداخەکەی دایەوە و جگارەیەکی داگیرساند، رووی کردەوە جوتیار و:

- کەی دەگەڕێیتەوە؟

- بابزانم کەی پێداویستیەکانی قوتابخانەم بۆ دابین دەکەن؟

عەولا خواردنەوەکەی خێراتر بوو، لەگەڵ پێکێکی ئەوان، ئەو دووانی دەخواردەوە، جگارەیەکی لە پاکەتەکەی هەژار داگیرساند، سەیرێکی ئەوانی کرد، کە بە نیگەرانی لێی دەڕوانن، بەزەردەخەنەوە:

- خەلکانێك بە خواردنەوە شێت دەبن، کەچی من ئاقڵ دەبم !!

هەژار لە گەڵ ئەو قسەیە، ماوەیەك چاوی بڕیە عەولا، ویستی لە بواری دەروونییەوە ئەو حاڵەتەی بۆ شیکاتەوە، بەلام هەر کە چاوی بە رووخسارە خەمۆکیەکەی هاوەڵی کەوتەوە، شەرمێکی نامۆ چاوانی داگرت، پاشان بۆ خۆشکردنی دانیشتنەکە و دەرچوونیان لەو بێ دەنگییە ترسناکە، رووی کردەوە جوتیار و:

- ئەمشەو پلە ئایش مەحاڵە خەوی لێ بکەوێت، دڵنیام ئەم شەو تا بەیانی، تەزبیحەکەی بەرنادات و دوعات بۆ دەکات.

- .........

لە گەڵ درکاندنی ئەو ناوە پیرۆزە، جوتیار خۆنەویستە پرسیارەکەی هاوەڵی پشتگوێی خست و کەوتە بیرهاتنەوەی خۆشەویسترین مرۆڤ لە ژیانی... پێش گواستنەوەیان بۆ ئەو دێیە بە چەند رۆژێك، کە فەرمانی گواستنەوەی بردەوە ماڵەوە، پلکە ئایش، بە رووخسارێکی خەمۆکی دەرگای حەوشەکەی بۆ کردەوە، ئەویش لە گەڵ هاتنە ژوورەوەی، بە داماوی ماوەیەك لە دیار لینەی بن هەیوانەکە وەستا، جامێك ناوی

خواردەوە و کەمێك بیری کردەوە، پاشان بێ ئەوەی ئاوڕ لە پلە ئایش بداتـەوە، لەگـەڵ دەستی خۆی کۆمەڵە پەڕاوەکەی هەڵگرت، لە سەرەوەی مام مەجید دانیـشت و پـشتی دایە دیوارەکە و لێیان وردبۆوە، مام مەجید لـە سـەر تەنیـشتێك راکـشابوو، خـەریکی رادێو زەبەلاحەکەی بـوو، بـە پەشـۆکاوی هـەر جـارەو شـەپۆڵەکانی بـۆ وێـستگەیەك دەگۆڕی، لەسەر هیچ یەکێکیانی نەدەوەستاند، لەدوایی بە توڕەیی دایخست و لـە شـوێن خۆی چوارمشقی دانیشتەوە، جگارەیەکی داگیرسـاند و: ئـایش دەڵێـت بـۆ واسـیتەیەك ناکەی تا جەنابتان لە شار بمێنیت، وادەزانێت مـن دۆسـتی بـاوکی بەڕێوەبـەرم... لـەو کاتەدا، پلە ئایش خەریکی ئامادەکردنی ژەمی نیوەڕۆ بوو، بـە بەهانـەی ئـەو قـسەیە، دەستی لە کارەکەی هەڵگرت و لە تەنیشت جوتیـار دانیـشت، بـە سـۆزێکی دایکانـە دەستی لە ملانی ئالآند، بە گرژی چـاوەکانی بڕیـە مـام مەجیـد و: مـن رێنـادەم ئـەم تاقانەیەم لێم دوورکەوێتەوە... بە دەنگێکی لەرزۆکەوە، ئەمەی گوت و بەزەیـەکی تـاڵ لە سەر لێوانی هەڵنیشت و بێ دەنـگ بـۆوە... جوتیـاریش بـۆ دڵنـەوایی کردنـەوەی، دەستی لە سەر شانی دانا و: دایە خۆ من ناچمە هەندەران؟ پاشان هـەمووی سـاڵێکە و دەگوازرێمەوە شوێنی جاران... بەڵام ئەو هەر ڕشت بوو لە سـەر قـسەکانی و: بـۆ یـەك شەویش رێگا نادەم، ئەگەر نا، ئێمەش لە گەڵتدا دێین... لەگەڵ بیستنی ئەو پێشنیارە، مام مەجید بەرووگەشییەوە: هەی رووت سپی بێت ئایش، بەخوای هزرێکی باشت کـرد، چەند لـە مێـژە ئـاو و هەوایـەکی پـاك و بێگـەردم هەڵنەمـژیوە ! جـارێکی تـر ئـەو پاسگەیەش دەبینمەوە، کە نزیکەی پێنج ساڵ تێیدا پاسـەوانیم کـردووە و هـەر لـەوێش تووشی ئەم بەڵایە هاتم... لە گەڵ درکانـدنی دوا دەسـتەواژەی، بـە رووگـرژی لـە دەم و چاوی جوتیار وردبۆوە،پلە ئایشیش بەهەڵچوونەوە لێی شیڕاندو: بۆ جا تۆ لە ژیانی خۆت کارێکی باشترت کردووە؟ ئەگەر لەبەر خاتری چاوی ئەو نەبوایە، دیارە من تا ئێستا لـە گەڵ تۆ دەمام؟!...

وەڵام نەدانەوەی جوتیار، کەش و هەواکەی بەسـامتر کردبـوو، هـەژار خـەریك بـوو زەندەقی بچێت،پەلاماری پەرداخەکەی دا و بـە یـەك قـووم بنـی هێنـا و جـارێکی تـر دایگرتەوە، جگارەیەکی تری داگیرساند و بە گریانەوە:

- ئەی چۆن؟! پێکەوە ژیان گرنگترین مەرجە بۆ خۆشەویستی !!

عەولاّ لە گەلّ ئەو هەلّوەستە سەیرەی، ماوەیەك بە پێکەنینەوە سەیری کرد، پاشان دەستی لەسەر ملی دانا و:

- هەروەها مەرجیشە بۆ رق و کین گرتن!! وابزانم خواردنەوە بەسکەیت باشترە !
- نا، ئاگام لە خۆیە، منیش دایکمم هاتەوە بیر.
- خودا لێی خۆش بێ.
- ماوە، پاش مردنی باوکم، شووی کردەوە و بەجێی هێشتم !!
- خۆ هاتوچۆی ناکەیت؟
- زرباوکم ناهێلێت سەردانی یەکتر بکەین !
- ئەگەر نا، حەزدەکەی سەردانی بکەیت؟
- ئەی چۆن؟ من بێکەسم و جگە لەوان کەسی ترم نییە.

لە گەلّ ئەو وەلاّمە، خەم و خەفەتێکی قووڵ رووخساری عەولاّی داپۆشی، سەیرێکی جوتیاری کرد، کە بە کەمتر خەمی خەریکی خواردنی مزەکان بوو، ئاخێکی هەلّکێشا و بنی بتلّەکەی رێژتە ناو پەرداخەکەی، نیو پێکی لێ دروست بوو، ناچار پەنای بۆ مام میخۆ برد، کە ئەو کاتە بەرەو مێزێکی دی بە تەنیشتیان تێدەپەڕی:

- مام ریخۆ زەحمەت نەبێت، بتلّێکی ترمان بۆ بێنە.

مام میخۆ لە گەلّ ئەو ناوزڕاندنەی، لە شوێن خۆی چەقی، ماوەیەك بە گرژی لە دەم و چاوی عەولاّ سێرەی گرت، بەلاّم هەر کە ئەو دەعبایە بە چاوقایی سمێلّە بۆرەکانی بادا و بە رووخسارێکی ترسناك زقەی لەو بەستەزمانە گرتەوە، ئەو ناچاربوو چاوەکانی پانکاتەوە، بە زەردەخەنەیەکی دەستکردە سەری خۆی چەماند و خێرا بتلّێکی تری هێنا و لە سەر مێزەکەی دانا، وەك دوورەپەرێزییەك ویستی خێرا دوورکەوێتەوە، بەلاّم دیاربوو، عەولاّ بە چاوتێبڕینەکەی مام میخۆ، کرمی شەڕانییەکەی مێشکی زیاتر بزوابۆوە و بەو هەندەش رق و کینەکەی دانەمرکابۆوە، وەك بلێین دەیویست مام میخۆ زێدەڕەوییەکی تر بکات، تاکو بەو بتلّە بەتالّەی بەردەمی، مێشکی پێ بپلیشێنێتەوە، بۆیە هەر کە کەمێك لە مێزەکەیان دوورکەوتەوە، جارێکی تر بانگی کردەوە:

- ئەریَ مام ڕەئۆ نەمانزانی ناوی جەنابی باوکتان چی بوو؟

مام میخۆ دەیزانی کە سەری ئەو لادێییە گەرم بۆوە و ئەگەر پەنا بۆ گاڵتەبازییەك نەبات، کار لە کارا دەترازیَ و مەگەر هەموو دانیشتوانی مەیخانەکەش ئەو کاتە بتوانن قوڕگی لە ناو چەپۆکە ڕەشەکەی ئەو ئەژدەهایە دەربهێنن، بۆیە بە ڕووخەندەیی لێی نزیك بۆوە و وەك پاڕانەوەیەك:

- ئینجا قوربان، ئێوە جارێك چارەیەکتان لە ناوی من کرد، تا نۆرەی ناوی باوکی رەحمەتیم بێت؟!

تریقەی پێکەنینە شێتانەکەی عەولاّ سەرانسەر مەیخانەکەی داگرت و سەرەنجی سەرجەم دانیشتوانی بۆ مێزەکەیان راکێشا، هەر کە هێور بۆوە، بەگەرمی دەستی بۆ گیرفانی برد و پارەیەکی زۆری دەرهێنا ودایە دەست مام میخۆ و:

- ها بگرە نۆێنباز، پارەی حەرام هەر بۆ تۆ باشە، کرمی سەرمت کوشت، ئەگەر نا، خوا خۆی دەیزانی چیت بەسەر دەهات.

مام میخۆ هەر کە بەخشیشە چەورەکەی وەرگرت، بە بەهانەی ئەنجامدانی کارەکانی، بە بازدان خۆی لە لە لێواری دەردەسەری دوورخستەوە، عەولاّش کە هێشتا زەردەخەنە لێوەکانی چۆڵ نەکردبوو، پاشماوەی ئەو بڕە پارەیەی ژماردەوە کە نیوە ئەختەکەی کچی مام عزەت بوو و دوێنیَ لە سەر فەرمانی ئاغا لێیسەند و ئەو شەویش پێرانەگەیشت بیداتە دەستی، پارەکەی گەڕاندنەوە گیرفانی، سەیرێکی تری ناو هۆڵەکەی کردەوە و لە گەلّ فڕکردنی قومێکی تر بە سەر لەقاندن:

- برادەران دەزانن کە ئێرە باشترین شوێنە بۆ مرۆڤی عازەب.

- ئەمەی گوت و ئەوە پێکەکەی فڕکرد، بە گەرمی پەرداخەکەی داگرتەوە، سەیرێکی هاوەڵانی کردەوە و:

- ئەریَ بەڕاست، ئێوەش وەك من عازەبن یان ژنتان هێناوە؟

هەژار کە ئەو کاتە زمانی گڕان ببوو، بە سەرگەرمیەوە ڕووی کردە جوتیاری هاوشێوەی و بە تێکەڵوپێکەڵی:

- ها.... ژن... خۆ بەراست جوتیار!! من و تۆ هەرگیز بیرمان لەم مەسەلەیە نەکردوتەوە؟!!

جوتیار کە تا ئەو کاتەش بێدەنگیی نواندبوو، وادیاربوو لە گەڵ خواردنەوە، هەروەك چۆن زۆرجار مەلا سالح لە کاتی دانیشتنیان، وەك پێشەکییەك بۆ ئاشکراکردنی نهێنیەکانی دەیگوت: (ئەم ژەقنەبووتە چ هێزێکی سیحراوی هەیە لە کردنەوەی دەرگای دڵە داخراوەکان)، ئەویش لە گەڵ خواردنەوەی پێکێکی تر، بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات، لە بیرکردنەوە قووڵەکەی دابڕا و دەرگای دڵی کرایەوە و بە سووکی تەماشایەکی هەژاری کرد و:

- تۆ جارێ دەست هەڵێنە و قەرزەکانی من و سمۆ بدەوە، هەتیوو تۆ ئەمرۆ قەرزی چەند ساڵەی دارتاشەکانیشت بە بەهانەی ئەو دوو سێ پارچە دارە بە من دایەوە.

- قسەی قۆڕ... قەرزی چی هەی بێ نان و نمەك... ئەوە دەساڵە بەخۆڕایی چارەسەرت دەکەم... ئەگەر لێکی دەینەوە، دە ئەوندەی پارەکەی تۆ و سمۆ و دارتاشەکە و کەسانی تریش قەرزاری من دەردەچیت.

- ئاخر جەنابتان دکتۆری من بوون، بۆیە ئێستا لەوپەڕی باشی دامە !

بە دڵنیاییەوە، هەژار رووی کردە عەولاّ و:

- بە سەری تۆ مام عەولاّ خەتای خۆیەتی... خۆی نایەوێت چاکبێتەوە... باشترین چارەسەریم بۆی دۆزیوەتەوە... خۆی نایکات، ئەگینا لە مێژ بوو چاك دەبۆوە.

جوتیار بە هەڵچوونەوە، رووی کردە عەولاّ و بە زمانێکی قورس:

- ئەرێ مام عەولاّ، سەرانسەر دونیا بنۆڕە، بیستووتە دکتۆرێك لە سەر راچێتی نەخۆشێکی نووسی بێت (رۆمانێك بنووسە)، جەنابیشیان هەر خەریکی کورتە چیرۆکن.

ئیتر ئەو عەولاّیەی، کە بە درێژایی ژیانی ئەو هەردوو هاوەڵە، بە ناپاکترین و دڕندەترین گیانلەبەری سەر رووی زەمین وێنا دەکرا، وادیاربوو بە ناوبژیوانی پاشای ئارەق دڵەکان ئاشبوونەوە، ئەو عەولاّ سەگەی جاران تەنها بیریان لە سکەتکردنی دەکردەوە، ئێستا بە خواردنەوەی چەند پەرداخێکی ئارەق، لێیان بووە مام عەولاّ،

ئەویش، کە ئەو کاتە خەریك بوو بنی بتڵەکەی تریش خواربکاتەوە ناو پەرداخەکەی، بە مەندەهۆشی رووی کردە جوتیار و:

- خێرە، خوانەکات، خۆ نەخۆش نیت؟!

جوتیار کە زمانی بە تەواوی قورس ببوو، نەوەك تێکەڵوپێکەڵی بکات، وەك پەنابردنێك، رووی کردە هەژار، ئەویش خێرا رووی کردەوە عەولا و:

- مام عەولا نەخۆشی جەستەیی نا، مەبەستمان نەخۆشی دەروونییە، ئەم کابرایە لە قوناغی منداڵیدا تووشی رووداوێکی دڵتەزێن هاتووە.

عەولا، ماوەیەك بێدەنگ بوو، بەرامبەر مێزەکە داهاتەوە و کەوتە بیرکردنەوە، پاشان بە رووخسارێکی خەمۆکی، ناخێکی هەڵکێشا و رووی کردەوە جوتیار:

- هەر چۆنێك بێت، کورتە چیرۆك بۆ کورتە خەم، تۆش وادیارە خەمەکانت وەك من ئەوەندە زۆرن مەگەر جێگایان لە ناو ئەو رۆمانانە ببێتەوە کە ئێوە باسی لێ دەکەن.

لە گەڵ ئەو وەڵامە چاورێنەکراوە، هەردووکیان بە حەپەساوی چاویان بڕیە یەکدی، هەژار سەیرێکی عەولای کرد و لە سەرخۆ:

- تۆ نەشت خوێندووە؟!

- چەند هەفتەیەك لە حوجرە، پاشان......

ئەمەی گوت و قومێکی تری لە پێکەکەی دا و مژێکی درێژی لە جگارەکەی هەڵکێشا، ئینجا لە سەر قسەکانی بەردەوام بۆوە و دەستی کردە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی و چۆنیەتی دەرکردنی لە حوجرە.

-٤-

لەگەڵ بانگی نیوەڕۆ، جوتیار لە خەوە قووڵەکەی بە ناگاهاتەوە، هەر کە بە هیلاکی سەیرێکی کاتژمێری دیوارەکەی کرد، بە شپرزەیی لە شوێن خۆی راپەڕی، بۆ زیاتر دڵنیایی، هەر کە دەستی بە چاوانی هێنا و تەماشایەکیتری کاتژمێرەکەی کردەوە، بە تەنگاوی پەلاماری هەژاری دا و بە توندی شڵەقاندی و لە خەوە قورسەکەی راپەڕاند:

- تۆبڵێی پێڕابگەم کارەکان ئەنجام بدەم؟!

هەژار، کە هێشتا خەو بەتەواوی چاوەکانی بەرنەدابوو، لەگەڵ دەنگی جوتیار بەلاچاوێك سەیرێکی دەوروبەری خۆی و چوار گۆشەی ژوورەکەی کرد و بە دوودڵی:

- ئەی عەولاّشمان لە گەڵ نەبوو؟!

بە بیستنی ئەو ناوە، جوتیار سەری لێشێوا، مەسەلەی قوتابخانە و پێداویستیەکانی لە بیر چوو، بە پەلە پەل بەرەو ژێر زەمینەکە بازیدا و پاش ماوەیەك بە تەنگاوی گەڕایەوە، هەموو ژوورەکانی نۆڕی، سەیرێکی ناو حەوشەکەی کرد و لە میانی دەرگاکەوە سەیرێکی ئەم لاو ئەو لای کۆڵانەکەی کرد، گەڕایەوە شوێنی خۆی و بە واقی وڕماو:

- تۆ بڵێی هەستی بە شتێك کردبێت؟!

هەژاریش ئەو شەو وەك جوتیار، بۆ خەوتن نەك هەر جل و بەرگەکانی نەگۆڕیبوو، بگرە پێلاوەکانیشی دانەکەنی بوو، هەر لە شوێن خۆی، بە خەواڵو چوارمشقی دانیشت، ماوەیەك بە هەردوو دەست دەم و چاو و کەللەی سەری شێلاند، ئینجا بێ ئەوەی سەری خۆی بەرزکاتەوە و سەیری جوتیار بکات، کە تا ئەوکاتەش بە شڵەژاوی لە دیار سەری وەستا بوو، لە سەرخۆ:

- مەگەر سەرۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە.

خێرا سەراویان کرد و دەم چاویان شووشت، بە تووڕەیی بەرەو چایخانەکە کەوتنە ڕێ، هەر بەرێوە، بە شەپرزەیی کۆڵان و شەقامە سەرەکیەکان و شوێنە بازرگانیەکانیان دەنوڕی، جار جار بە شەرمەزاری چاویان دەبڕیە یەکدی، هەر کە چاویان بەریەك دەکەوت، بە ڕواڵەتی پشکنین و بەدواداچوون، هەردووکیان یەکسەر ڕووی خۆیان بۆ لایەکی تر دەگۆڕیەوە، لە ڕاستیدا هەڵوێستێکی پڕ خەجاڵەتی بوو، ئەوەندە مانگە پاش ئەوەی هەرسێکیان وەك دەستەی سوێندەران، بە تۆمەتی کوشتن و ئەتك کردن، بە تێکڕای دەنگەکان بە پاشملە، بڕیاری تاوانبارکردنی عەولایان دەرخستبوو، چاوەڕێی هەل و مەرجێکی ئەوتۆ بوون، کە دوێنێ ڕۆژگار بە پیاوەتی خۆی بۆیانی ڕەخساندبوو، کەچی زۆر بە کەمتر خەمی دەستیان لەو دەرفەتە بەردا و تاوانبار زۆر بە ئاسانی قوتاری بوو، بەڵام هەروەك خۆیان مەسەلەکەیان هەڵدەسەنگاند، خەتای هەردووکیان نەبوو، بەڵکو خەتای سۆزی ترسنۆك بوو، ئەوان هەردووکیان ئەوەندەیان خواردبۆوە، کە بە تەواوی لە هۆش خۆیان چووبوون، کەچی ئەو هەتیوە ناخواتەوە، دەبوایە ئەو پیلانەکەی جێبەجێ بکردایە، ئاخر ئەوان هەر دوێنێ بە ڕێکاوە، کاتێك ماوە ماوە عەولایان لێ دادەبڕا، پیلانێکی تەواوکەر و بێ چەن و چوونیان بۆ لە ناوبردنی داڕشتبوو، کە مەحاڵ بوو ڕزگاری بێت و هەر بۆیەش بە تێکڕای دەنگەکان دارشتنی پیلانێکی تری یەدەگی ڕەتکرایەوە، چەندین مانگە وەك دەستەی سوێندەران، حوکمی لەناوبردنیان دەرکردبوو، بەڵام هەر سێکیان لە سەر شێوەی لە ناوبردنەکەی ناکۆك بوون، هەریەك دەیویست بە جۆرێك ئەو تاوانبارە دڕندەیە تەفروتونا بکات، بە شێوەیەکی ئەوتۆ حوکمەکە جێبەجێبکرێت ، کە گڕکانی هەڵچوونەکەی ناخیان دامرکێنێتەوە، بە دەیان بگرە بە سەدان شێوازی باو و ناباویان خستە دەنگدانەوە و هەر هەموویانیش، پاش تاوتۆکردن و چاوپێخشاندنەوە لە ئاکامدا ڕەتدەکرانەوە، ئیتر بە سەرجەمگیری دەنگەکان، نەك هەر پرسی کوشتنەکەی یەکلایی کرابووە، بگرە کاتێ باسیان لە چۆنیەتی لە ناو بردنیان دەکرد، وشەی کوشتنیان بە کار نەدەهێنا، بەلکو دەیانگوت: دەبێ وەك سەگ سەکەتی

کـەین، یـان وەك گوێدرێـژ بیتـوێنین، کـە باسـیش لـە چـۆنیەتی لـەناوبردنی لاشـە مردووەکەیان دەکرد، وشەی تەرم یان کەلەشیان بەکار نەدەهێنا، بەڵکو دەیـانگوت: لاك یان کەلاك یان کەلەخ، ئیتر کێشە سەرکیەکەیان تـەنها شـێوازی جێبـەجێکردنی بڕیـارە بنبڕەکە بوو، کە دوێنێ ئەو مەسەلە گرنگەش یەکلا بۆوە، بگرە شێوەی جێبـەجێکردنی حوکمەکەیان وەك ئیلهامێك لە خودی عەولایان ﷺ هات !! ئەی ئـەوە نـەبوو دەیگـوت (ئەو وەك عیسا بێ باوکە)، کەواتە ئەو دەبێت بە هەمان سزای عیـسا بگـات، دوێنـێ هەرسێکیان لە سەر ئەوە رێککەوتن، کە پاش نیوە شەو کاتێك عەولایان بە سـەرخۆشـی گەیاندە ماڵ، بەو خاچە زەبەلاحە ببەستنەوە، کە سمۆ هەر بەو شەوە لە ژێـر زەمینەکـە دایمەزراندبوو، ئـەوەك لـە ژێـر ئـازاری کوتـانی بزمـار بـە ئاگابێتـەوە، یەکـەمجار بـە گوریسێك، کە ئەویش ئامادەکرابوو، قایم دەیانبەستەوە، پاشـان تـاکو دراوسـێکان بـە ئاگانەیەن، بە پارچە پەڕۆ دەمیان دەبەست، ئینجا لە سەرخۆ، ئیتر وەك پیویست بزمـار و سنگەکانیان لە هەسترین ئەندامانی جەستەی دەچەقاند، لـە گـەڵ ئـەو بیرکردنەوانـە، هەردووکیان بە بێدەنگی بەرەو چایخانەکە هەنگاویان دەنا، هەژار بە هۆی بەژن کـورتی خۆی لە چاو جوتیار، تاکو خێرایی چوونە رێگاکەیان هاوسـەنگ بکردایـە، دەبوایـە لـە جیاتی دوو هەنگاوی جوتیار، ئەو سێیانی بهاوێـشتایە، هەناسـەکانی سـوواربوون، بـە بۆڵە بۆڵەوە، بێ ئاوڕدانەوە:

- ئەم ناپیاوە خێری باوکی نەبوو، تا خێری ئێمەی هەبێت.
- خەتای خۆمان بوو، دەبوایە پشتمان بەو نەوێرە نەبەستبوایەوە.
- چ لەوچە و چەنەبازێك دەرچوو، دەیگوت ئێوە بەس سەرخۆشی کـەن، خـەمتان نەبێت من لە حەقی دێم.
- پێم گوتی خەتای خۆمان بوو و ئیتر بیبڕێنەوە.
- خوا دەزانێت هەر کە گەیـشتینە چـایخانە، دەبێـت بـە یـەك شـەقا زللـە ئـەو سەگبابە بە زەویدا رایکێشم.

پێش ئەوەی بگەنە چایخانەکە، بە چەند مەترێك، هەر لە دەروازەی کۆلانەکە، هەژار بە تووڕەییەوە بانگێکی راهێلا و:

- سمۆی قەشمەر.

لە گەڵ بیستنی بانگەوازەکە، سمۆ لە چایخانەکە دەرپەڕی و بە چاوترووکانێك بەرامبەریان وەستا، هەژار ویستی پیاوەتی خۆی لە رێگای ئەو بەستەزمانە بسەلمێنێت و شەقازللەکەی بوەشێنێت، بەڵام جوتیار دەستی گرت و لە سەرخۆ رووی کردە سمۆ و:

- سمۆ کوا عەولاّ؟!

- ئەوەتا لە چایخانەکە دانیشتووە !!

دوو تەزووی یەك لە یەکدی ساردتر جەستەی هەردووکیانی داگرت، لە شوێن خۆیان چەقین، دوو هەناسەی ساردتریان هەڵکێشا، ئەوەك ترس و پەژارەیان لە رووخساریان بە دی بکرێت، بە شەرمەزاری سەیری یەکدییان کرد، گوڕێکیان هێنایەوە بەرخۆ و چوونە ژوورەوە، عەولاّ بەتەنیا لە سەرووی ژوورە پان و بەرینەکە دانیشتبوو، بە وردی لە کتێبەکەی دەڕوانی، بە سەختی پیتی وشەکانی لێکدەدانەوە، هەر کە چاوی پێیان کەوت، کتێبەکەی دانا و لە شوێن خۆی قیت بۆوە و بە گەرمی:

- بە خوا نارەقێکی خۆش بوو، من بە تەنیا بتڵێکم تەواوکرد، ئێوەش بە هەردووکتان بتڵێك، بە تەواوی سەر خۆش ببووین، خودا خێری سمۆ بنووسێت ئێمەی گەیاندەوە ماڵ.

دانیشتن و لە گەڵ دوو چایە، هەریەکە و جگارەیەکی داگیرساند، عەولاّ بەگەرمی رووی کردە جوتیار و:

- ئەی نەدەبوایە سەردانی بەڕێوەبەرایەتیت بکردایە؟

- ........

لە گەڵ بێدەنگی جوتیار، هەژار ناچار بوو وەڵام بداتەوە:

- درەنگ هەستاین، دەبێ ئەمرۆش بمێنینەوە.

عەولا، کتێبەکەی بەدەست گرتەوە و:

- بەیارمەتیتان دەبێت برۆم.

هەرسێکیان پێکەوە:

- بۆ کوێ دەڕۆی؟!

- جارێ نازانم، بەلام بۆ بژێوی ژیانم دەبێت بەدوای شوێن و کارێك بگەرێم.

جوتیار بە سووکایەتی:

- ئینجا تۆ لە چ کارێکدا شارەزای؟

لە گەل ئەو قسەیە عەولا، ماوەیەك بێدەنگ بوو، هەر بە پێوە جگارەیەکی تری لەو پاکێتە داگیرساند کە ئەو بەیانییە سمۆ بۆی کڕیبوو، بە زەردەخەنەیکی دەستکردە:

- کوشتن، تالانکردن، سووتاندن، ئەتك کردن، هەموو بەدکارییەکان !! ئەی چۆن؟! دوێنێ شەو بۆتانم باس نەکرد؟! کەسێك دەرچووی هەمان قوتابخانەی من بێت، تۆ بلێی لە چ کارێکدا شارەزا بێت؟!!

- .........

لە گەل ئەو وەلامە جوتیار بێدەنگ بوو و نوقمی ناو بیرهاتنەوەی ئەو بەسەرهاتە دژوارانەی عەولا بۆوە کە دوێنێ شەو بە شێوازێکی دلتەزێن بۆیانی باسکردەوە، هەژاریش بە پەشۆکاوی سەیرێکی جوتیاری کرد و ناچار لە شوێن خۆی هەستایەوە، رووی کردەوە عەولا و بە دوو دلی:

- هەتا شوێن و کارێکت دەستکەوێت، دەتوانی لای ئێمە بمێنییتەوە.

- جارێ با برۆم، ئەگەر هیچم دەست نەکەوت ئێوارێ دەگەرێمەوە، هەرچۆنێك بێت، سوپاستان دەکەم و دلنیابن لە بیرتان ناکەم.

قسەکانی تەواو کرد و بە روویەکی زیاتر راستی پێوە دیار بوو، رووی کردە جوتیار و

- نازانم بۆ؟!... لەو بارە ئاڵۆزەشدا، دەمتوانی بە هەزار و یەك ڕێگا خۆم ڕزگارکەم، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، هەر ویستم تۆش لە گەڵ خۆم ڕزگارکەم و بە جێت نەهێڵم، لە ڕاستیدا نازانم بۆ ویستم ئەو ئارەزوویەی ئاغا پوچەڵ کەمەوە، من ئاگاداری ئەو پیلانە بووم، کە بۆ کوشتنی تۆ دارێژرا بوو، باوەڕ بکەن لە ناخی دڵ و ویژدانمەوە، هەستم بە بەرپرسیاریەتی کرد، ویستم لە دوا ساتی ژیانم کارێکی مرۆڤانە ئەنجام بدەم، بە هەرحاڵ سوپاست دەکەم کە منت گەیاندە شار، بەڵام وریابە لە گەڕانەوەت.

ئێوارەیەکی درەنگ پەرتووکخانەکەیان داخست و گەڕانەوە ماڵەوە، هەریەکێك لە گۆشەیەکی ژوورەکە، بێدەنگ لاپەڕەی پەرتووکەکەی دەستی هەڵدەدایەوە، بێ ئارامی کەش و هەوای ژوورەکەی داپۆشیبوو، بە پەرۆشەوە چاوەڕێی گەڕانەوەی عەولایان دەکرد، بۆ زیاتر دڵنیایی، چەندین جار هەرسێکیان بەرەو ژێرزەمینەکە نشیووبوونەوە و خاچەکەیان پشکنیوە، لە ناوەندی ژێرزەمینەکە، سەرێکی بڕبڕەی خاچەکەیان لە زەوی چەقاندبوو و سەرەکەی تریشی بە شیشە ئاسنێکەوە هەڵواسیبوو کە لە بنمیچە کۆنکریتیەکەدا دەرپەڕیبوو، هەژار وەك وەستایەکی شارەزا، لە دەوروبەری خاچەکە دەخولایەوە و دەستی لە بڕبڕە و باڵەکانی دەدا، جار و بار بۆ زیاتر قایم کردنی پارچەیەکی، ئاوڕی لە سمۆ دەدایەوە و بە وردی سەری پەنجەی لە سەر خاڵێك دادەنا و بە شۆڕکردنەوەی لایەکی لێوی خوارەوەی، ناڕازیبوونی خۆی دەردەبڕی، ئەویش بە ئەو پەڕی گوێڕایەڵی، دەستبەجێ بە چەکوشەکەی دەستی بزمارێکی تری لە شوێنپەنجەی وەستاکەی دەچەقاند، جوتیار کە زیاتر لە هەموویان خۆی بە هاروهاجتر دەردەخست، هەر چەند چرکە جارێك دەیڕوانیە کاتژمێرەکەی دەستی و هەناسەیەکی بێ ئارامیی هەڵدەکێشا، بۆ قاتی سەرزەمین سەرکەوتەوە، سەری لە دەروازەی حەوشەکە دەرخست، ئەم سەر و ئەو سەری کۆڵانە چۆڵەکەی نۆڕییەوە، بە دڵتەنگی گەڕایەوە ژوورەکە و لە شوێنی جارانی دانیشتەوە، لاپەڕەی کتێبەکەی هەڵدایەوە، هەژار و سمۆش بە هەمان شێوە سەرکەوتنەوە و هەمان رەفتاریان ئەنجامدا، لە شوێنی خۆیان وەرگەڕانەوە، جوتیار ئاخێکی تری هەڵکێشا و:

- دەترسم نەگەڕێتەوە.
- دەبێت هەر بگەڕێتەوە و.......

هەژار بـەدڵنیایی وەڵامـی جوتیـاری دایـەوە و بـێ پـچڕانی قـسەکانی، بـە گـرژی چاوەکانی بڕیە چاوانی سمۆ و:

- ..... بـەڵام ئاواتـەخوازم بـەیانی هەسـتمەوە و عـەولاّ بـە خاچـەکەوە هەڵئەواسرابێت، ئیتر هەر خۆم دەزانم کێ لە جیاتی ئەو هەڵدەواسرێت.

سمۆ کە دەنگی دڵی لە ترسان دەبیسترا، هاواری بۆ جوتیاری برد و:

- ئاخر مامۆستا، ئەو چەکی پێیە !! ئەوەك لـەو بینەوبەردەیـە بـە ئاگابێتـەوە، نەبادا هەر خۆشتان شایەتی ئەوەتان دا، کە چ نیشانەوانێکی بلیمەتە؟!

هەر کە جوتیار بە هانـای نـەهات و هـەردووکیان بـە تـوڕەیی چـاویان تێـبڕی، بـە دڵەڕاوکی وناشو درێژەی بە قسەکانی دایەوە و وەك پاڕانەوەیەك:

- باشە گریمان ئەویش لە هۆش خۆی چوو، من کەی دەتوانم بە تـەنیا رایکێـشمە ناو ژێرزەمینەکە و پاشان بەرزی کەمەوە و لە خاچەکە ببەستمەوە؟! ئاخر ئەو دووسەنگ و قەبارەی منی هەیە.

جوتیار بەو قسەیە رازی بوو، بەڵام هەژار جارێکی تر بە توڕەیی:

- هەتیوو ئاخر ئێمە ئەگەر لەگەڵیدانەخۆینەوە، چۆن دەکرێت مەستی کەین و.....

لە گەڵ بیستنی زەنگی دەرگاکە، هەژار قسەکانی پچڕاند، هەموویان بە تەنگەتاوی و پەشێوی لە شوێن خۆیان ڕاپەڕین و ویستیان بەرەو دەرگاکە رابکەن، لە ناکاو هەستیان بە خـۆکرد، جوتیـار بـە رووخـسارێکی شـەرمەزارییەوە تەماشـایەکی هـەژاری کـرد و گەڕایەوە شوێنی خۆی، ئەویش بە هەمان شێوە لە شوێن خۆی دانیشتەوە، سـمۆش پـاش کردنەوەی دەرگاکە، لەگەڵ عـەولاّ گەڕانـەوە ژوور، سـمۆ خێـرا سـفرەکەی لـە ناوەنـدی ژوورەکە راخست، عەولاّش لەگەڵ سلاّوکردنەکەی، شت و مـەکـەکانی دەسـتی لـە سـەر سفرەکەی ریزکرد و بە رووخسارێکی گرمژین:

- ئەمرۆ هیچم دەست نەكەوت، گوتم با ئەم شەویش بێمەوە لاتان، لە گەڕانەوەش بەرامبەر مەیخانەكەی مام ڕیخۆ تێپەڕیم و كەرستەكانم لە گەڵ دەستی خۆم هێنا، گوتم شەو درێژە و بێ مەینۆشین شەوبەسەربردن مەحاڵە.

هەر لە گەڵ ئەو قسانەش، چاكەتەكەی داكەنی و لە گەڵ دەمانچەكەی لە گۆشەی سەری ژوورەكە داینان و بەرەو ناودەستی ناو گەرماوەكە رۆیشت، سەرەتا هەر سێكیان لە شوێن خۆیان بە واقی وڕماو چاویان بڕیە دەمانچەكە، دەسكە شووشە بریقەدارەكەی بە جۆرێك دەینازاند و تیشكی رووناكی گلۆپەكانی ژوورەوەی دەیشەوقاندن و دەیشكاندنەوەی نێوچاوانیان و پێڵووكانیانی پێ دادەخست، هەر وەك گوتراوە دەرزی هەڵبدرایە دەنگی ناهات، نوقمی ناو بێدەنگییەكی رەها بوونەوە، ئینجا كەی وەختی دەنگە؟! رۆژگارێكە و ئەوان دەنگە دەنگیانە و دەنگ رازی دڵیانی دەرنەچواند، هەرسێكیان بۆ ماوەیەكی گونجاو بە هەناسە هەڵكێشان و هەناسە دانەوە برۆكانیان هێناوە یەكدی، بە تێڕوانینێكی نازایانە چاوە تیژەكانیان بڕیە یەكدی، شێوەگەلی تیشكی لێزەرێك لە چاوانیان دەرپەڕی و لە هەرسێ لاوە وەك نووكی سێ شمشێری بریقەدار بدرێت لە یەك، زرنگێنیان دایەوە، خەریك بوون هەر خۆبەخۆ بە شەڕە چاو یەكدی لە خڵتانی خوێن بگەوزێنن، ماوەیەكی باش چاوە تیژەكانیان تێكبڕی، بەڵام زۆری نەخایاند، پەیتا پەیتا تیشكەكان كپ بوونەوە، وردە وردە ورەیان بەردا، سەرئەنجام روخساری هەر یەكێكیان لەوە دەچوو كە چاوی لەوە بێت یەكێك لە هەردووانی تر هەڵوێستێكی پیاوانە بنوێنێت و ئەو هەلە زێرینە لە دەست نەدات، وەك سەگەلەیەك، سەرەتا خەریك بوون بە حەپە و مڕەمڕ شالاوێكی بوێرانەی بۆ ببەن و وەك بەرازێك بیهەنجێنن و رازی دڵیان دەرچوێنن، ئینجا لە پڕێكدا بە نووسكە نووسك پاشگەز بوونەوە، بە هەرحاڵ گەڕانەوەی عەولا، ئەوانی لەو هەڵوێستە پڕ رووڕەشی و شەرمەزارییەی رزگاركرد و دەروونە پەشوكاویەكانیانی حەساندەوە، ئەویش چوارشانەیی و بە شەوكەت لە سەر سفرەكە دانیشت وەك خاوەن ماڵ:

- وەرن با ئەم ژیانە نەگبەتییە بە سەرخۆشی بەینە سەر !!

هەر سێکیان بە گەشکەیی بۆ ماوەیەك متەقیان نەکرد، پاشان جوتیار بەبەهانەی خوێندنەوە، لە شوێن خۆی نەجولاویەوە، هەژار ناچار بوو بە روو گەشی یەکی دەستکردە، تەماشایەکی جوتیاری کردو:

- راست دەکات مامۆستا، خۆ شەو بێ مەی تەواو بوونی مەحاڵە.

- ئێوە نووشی کەن، من ناتوانم، دەبێ بەیانی زوو هەڵسم.

هەژار و عەولاَ بەرامبەر سفرەی خواردنەوە چوارمشقی دانیشتن و پەرداخەکانیان داگرت و دستیان بە خواردنەوە کرد، عەولاَ لە گەڵ خواردنەوەی پێکی یەکەم و داگرتنەوەی پەرداخێکی تر، جگارەیکی پێشکەشی هەژار کرد و یەکی تریشی بۆ خۆی داگیرساند و:

- ئەم کتێبە بچووکەی تەنیشتت چی یە؟!

- ئا... ئەم نامیلکەیە؟... ئەمەیان کورتە چیرۆکن.

- کورتە چیرۆك؟!

- ئەم !

- دەکرێت چیرۆکێکم بۆ بخوێنیتەوە؟

هەژاریش کە بە یەك قوم بنی پێکی یەکەمی تەواو فڕکرد، پێکی دووەمی داگرتەوەو کتێبەکەی هەڵگرت و چەند لاپەڕەیەکی هەڵدایەوە و بە شەرمەزاری و نیگادزە سەیرێکی جوتیاری کرد و:

- هەر لە منداڵیدا فێرم کرد، لە هزر و قسە و کرداری، چۆن راستگۆ بێ و درۆ نەکات؟... زۆر بەتوندی راسپاردەکانی پیادەکرد... تا رادەیەك کە گەورە بوو کاری نەما، نانی نەما، هاورێی نەمان... تا رادەیەك نیتر منیش لە تواناممدا نەما چیتر لە گەڵیدا بمێنمەوە!!.

هەر کە هەژار تەواو بوو، بەگەرمی لەدەم و چاوی عەولاّ وردبوّوە، ئەویش بە هەمان شێوە، بەسەر لەقاندنەوە، چاوی تێبڕیبوو، بە پەرۆشی چاوەڕوانی تەواوکردنی سەربردەکە بوو، بەلاّم هەر کە بێدەنگی هەژار درێژەی خایاند، ئەو ناچاربوو:

- ئێ...پاشان؟!

- پاشان چی؟... تەواو!!

- تەواو !... چی تەواو؟!... بۆ تۆ جارێ هیچت گوتووە؟!

وەك هەورە تریشقە، سەدای تریقەی پێکەنینە شێتانەکەی هەرسێکیان لە سەرانسەر حەوش و کوّلاّنەکە دەنگی دایەوە، هەژار کە ئەو کاتە کتێبەکەی لابردبوو و فڕێکی گەورەی لە ئارەقەکە دابوو و هێشتا قومی نەدابوو ،پێکەکەی لە دەست کەوت و خۆیشی کەوتە سەر گازی پشت و خەریك بوو بخنکێت، عەولاّ پەلاماری داو کێلی کردەوە و جامێك ئاوی دایێ و:

- خوا بتانگرێت ڕەزاگرانینە، نەچیرۆکتان چیرۆکە و نە پێکەنینتان.

جوتیار کە هێشتا بەرماوەی پێکەنینەکەی رووخساری داپۆشی بوو، کتێبەکەی هاوێشتە لایەك و لە سەر ئەژنووکانی بەرەو سفرەکە خۆی خشاند، پێکێکی داگرت و بە یەك قوم پێکەکەی خواردەوە، جگارەیەکی لە پاکەتەکەی بەردەمی عەولاّ داگیرساندو:

- کەواتە هیچ لە چیرۆکەکە تێنەگەیشتی؟

عەولاّ، ماوەیەك سەری خۆی خوراند و بە شەرمەزاری و ساویلکانە:

- ئەم جۆرە چیرۆکانە زامەکانی ناخم سارێژ ناکەن !

- پەلە مەکە، رۆمانەکەی من کە تەواو بوو، ئەهامەتی هەردووکمان چارەسەر دەکات !!

ئەمەی گوت و پەرداخێکی تری داگرتەوە، هەژاریش هەردوو پەرداخەکەی خۆی و عەولاّی داگرتەوە، زۆری نەخایاند، بنی بتڵەکە هات، جوتیار بە سەرگەرمی سویچی جێبەکەی بۆ سمۆ فرێدا و:

- دەی سمۆ گیان بتبینم مەیخانەکەی مام ریخۆ بگوازیتەوە ئێرە.

سمۆ هەر بە ئاسمانەوە، سویچەکەی گرتەوە و لە شوێن خۆی راپەڕی، پاش ماوەیەك لە گەڵ دوو بتڵی تر و چەند قاپێك نۆك و باقلە و کەرستەی تری خواردن و مزە، کە وەك دیاری، مام میخۆ بۆ عەولای ناردبوو، لە سەر سفرەکە ریزی کردن و خۆیشی پەرداخێکی هێنا و چوارمشقی لە تەنیشت عەولا دانیشت و:

- مام عەولا بۆ منیش پێکێك داگرە.

وادیاربوو خێرایی خواردنەوەکە هەموویانی بە یەکجاری سەرخۆش کردبوو، ئەو دەستپێشخەریەی سمۆ بۆ خواردنەوەی یەکەم پێك لە ژیانیدا، سەرنجی هیچ کامێکیانی رانەکێشا، هەر کە عەولا بڕێك نارەقی رشتە ناو پەرداخەکەی و ناوەکەی کردە سەر، هەژار بە دەستی خۆی دوو سێ پارچە سەهۆڵی بۆ بەردایەوە ناو پەرداخەکە، ئەویش هاوشێوەی هاوەلانی، چاوانی خۆی نوقاند و بە یەك قوم بنی پەرداخەکەی هێنا و هەر خۆیشی پەرداخی دووەمی داگرتەوە، هەژار ماوەیەك بە نامۆیی سێرەی لە دەم و چاوی سمۆ گرتەوە، بۆنی حالەتێکی نائاسایی دەکرد، بەلام هەر کە بۆی ئاشکرا نەبوو، ناچار رووی کردەوە عەولا و:

- کۆمەڵگای بۆگەن هەمیشە دڕندە دروست دەکات، وادیارە مام عەولا تۆش خاوەن بەسەر هاتێکی دڵ تەزێنی!! بەلام خۆشەش بۆ مرۆڤی خەمبار کەسێکی هەبێت ناخی خۆی بۆ هەڵڕێژێت، ئیدی هەڵیکە و بۆتی رەخساوە و هەر چی لە دڵتدا پەنگی خواردووە دەری بهێنە.

عەولا لە گەڵ فڕکردنی پێکەکەی بە سەر لەقاندن ناخاوتنەکەی بۆ سەلماند، جگارەیەکی تری داگیرساند و:

- یەکەم تاوان کە ئەنجامم دا، عەلاوەدینی هاوەڵی منداڵیم بوو، کە نەك هەر تانە لێدانەکەی هۆکاری سەرەکی دەرکردنم لە حوجرە و خۆکوشتنی دایکم بوو، بگرە هەر وەك پاشان بۆم دەرکەوت، شەقازللەکەی منداڵیی هەر لە بیر مابوو، وەك

تۆڵەسەندنەوەیەکیش لە گەڵ تاقە هاوەڵەکەی میرزای کوڕی مـام هـەمزە، کـە ئـەویش پاشـان شایـستەی چارەنووسـێکی دژوار بـوو، بەدرەوشـتانە رەشـۆی سـەگمیان دەرماغخواردکردبوو، ئەو کاتە، قۆناغێکی زۆری لە خویندنی مەلایەتی بڕیبوو، لـە شـار دەیخوێند، چەند هەفتە جارێك دەگەڕایەوە ماڵەکەیان، باوکیشی زۆر شانازی بەوە دەکرد، کە کوڕەکەی پاش چەند ساڵێکی تر دەبێتە مەلایەکی گەورە، جارێکیان کە بەسـەردانی هاتبۆوە، بۆسەم بۆ دانایەوە، هەر لە ناو مزگەوتدا ئەو هەلەم بۆ رەخسا، بـەیانی بـوو، مزگەوت چۆڵ بوو، لە ناو حوجرەکە دەیخوێند، چوومە ژوور و دەرگاکەم داخست، ویستی هاوار بکات، خەنجەرەکەم لێی هەڵکێشا و درێژی عەردم کرد و شـەرواڵەکەیم داکـەنی و (........) !! یەکەجار زۆرم ئێشاند، پاش چەند رۆژی تر، جارێکی تر لە هەمان شـوێن و بە هەمان شێوە تووشی بوومەوە، ئەو جارەیان لەبەرگری کردن سستر بـوو، زۆر دەستی هەڵندەهێنا، جاری سێیەم، بڕوابکەن هەر خۆی بەدواما هات و داوای لێ کـردم تـا ئـەو کارەی لەگەڵ بکەم، ئیتر وای لێ هات نەك لە گەڵ من، بگرە کەسێکی ناتەبا نەما ئـەو کارەی لە گەڵ نەکات، کە گەڕایەوە شاریش، دەڵێن گوایە هەر لە سەر ئەو بەدکارییـەی بەردەوام بووە، تا رۆژێك ئاشکرابوو، ئینجـا بەتونـدی ریـسوا کـرا و لـە خویندنەکـەی دەرکرا، سەرئەنجام، لە شەرمان لە گەڵ بنەماڵەکەی دێیەکەیان جێهێشت و تا ئێـستاش کەس نازانێت روویان کردە کام لا، هێ هێ، ئەو مەلایەی کە لە سـەر ئـەو سـەگبابەش دەری کردم و نەیهێشت ببمە میراتگری پێغەمبەران، قوربانی مردنم کرد، پاش نیـوەڕۆی هاوینێکی گەرم، بە تەنیایی لە هەمان حوجرەدا نووستبوو، پـووره هـەنگێکی ئازڕیـایم ناودیوی ژوورەکە کرد و پوختە دەرگاکەم لە سـەر گـرت و ئینجـا هـەر خۆتـان وێنـای چارەنووسەکەی بکەن.

- له گەڕانەوە ئاگاداری خۆت بە !!... هەر هیچ نەبێ لەم ڕۆژانە... وا باشە بەتەنها هاتووچوو نەکەیت... گەر ڕێگا بدەیت من هەتا هەمان شوێنی ڕووداوەکە لەگەڵت دێم؟

عەولا لەگەڵ ئەو قسەیەی ئاراستەی جوتیاری کرد، بەرماوەی چێشتەکەی لە ناو کۆنە ڕۆژنامەکە پێچایەوە و فڕێیدایە ناو زبڵدانەکە، جوتیار و هەژار بە یەکجاری زمانیان بەسترابوو و نقەیان نەدەهات، هەردووکیان بە شەرمەزاری لە دیار پیاڵە چایەکانیان دانیشتبوون و مژیان لە جگارەکانیان دەدا و وەك دووکەڵکێشی شەمەندەفەر دووکەڵ لە دەم و لوتیان دەهاتە دەرەوە، سمۆش کە شەوی رابوردو بۆ یەکەمجار لە ژیانی، تا خۆی لەو ئەرکە دڵتۆقێنەرە رزگارکات، بە دووپێك ئارەقی بۆن رازیانە، خۆی لە رووباری ئارەقی بەهەشت بێبەشکرد، بەرەبەیانێکی زووش هەر لە سەر سەرینەکە، بەنیگادزە سەیرێکی هاوەڵانی کرد، هەریەك لە گۆشەیەکی ژوورەکە، بەشێوەیەکی ناڕێك و بێسەروبەر راکشابوون و پرخ و هۆڕیان بوو، ئەوەك وەستا هەژار بە ئاگابێتەوە و ئەوەی خراپە بە سەری بێنێت، هێواش هێواش وەك پەروانە لە شوێن خۆی هەستایەوە، لە سەر پەنجەی پێیەکانی هەنگاوی نا، هەر کە لە دەروازەی حەوشەکەش ئاوا بوو، وەك باڵندەیەك کتوپڕ لە دەمی گورگێکی برسی ترازابێت، بەرەو چایخانەکە دای لە شەقەی باڵ، هەر بەرێگاوە بە شپرزەیی خۆی دەدواند: ئاخر ئەمەیە بێدادی و نامەردی، هەی ناپیاوینە... ئەوان دەبوایە ئەو ئەرکە بارگران و ترسناکەیان پێی رانەسپاردبوایە، ئەی هەر خۆیان جارو بار لە کاتی سووکایەتی پێکردنیان، هەمان بانگەوازە ئابڕووبەرەکەی باوکی لە نێو چاوانی نادەنەوە و پێی نالێن: سمۆ بگرن !!... خۆ ئەگەر سمۆش پیاوکوژ بووایە، ئەوەتا حەرامزادە دەرنەدەچوو و نکۆڵی لە بنەماڵە شەڕانییەکەی نەدەکرد و ئەو هەموو مەڕ و ماڵاتەی جێنەدەهێشت و نەدەبووە شاگردی

چاچیەکی سەگباب، کە بەرامبەر رۆژانەیەکی هیچ و پووچ، هەر لە بەرە بەیانییەکی زووە تا ئێوارەیەکی درەنگ چایەکانی پێ دابەش دەکاتە سەر مەعمیلەکانی و پیاڵەکانی پێ دەشوات و ناو چایخانەکەی پێ گسك دەدات و مەگەر داوای شتی تریشی لێ نەکات هەر باشە، هەردوو پاڵەوانی شاریش کە بە درێژایی بیست ساڵ خەریکی دارِشتنی سەدان پیلانن بۆ لە ناوبردنی نەیارەکەیان، ئەمڕۆ بە بەهانەی هاندانی دوژمنیان بۆ خواردنەوە، خەریکن ساوێلکەیەکی دەشتەکی بچەوسێنن ولە خشتەی ببەن و تاوانەکەی پێ ئەنجامبدەن، بە بەهانەی مەستکردنی مێردی دایکیان، دوو ئەوەندەی ئەو دەخۆنەوە و دەیانەوێت بتڵکەش لە سەری ئەودا بشکێنن و سەری بتڵەکەش لە ناوەندی قینی بچەقێنن، قیڕ و سی لە رووبارە ئارەقەکەی بەهەشت، ئینجا مرۆڤ لە بەهەشت چ پێویستیەکی بە خواردنەوەی ئارەق هەیە، ها، ها ها ه، چ ئارەقێکیش؟!... لە سەر قسەی مەلای گوندەکەیان، ئەو ئارەقە ماددەی هۆشبەری تێدا نییە !!... واتە چی؟!...
خۆ مرۆڤ ئەگەر بۆ خۆشکردنی کەللەی نەبێت، ناچارنییە ئەو بۆگەنە قوزەڵقورتکات، پاشانْ قیبروسیا با ئەو تۆیزەش لە سەر هەمووی بێت، خۆ هەر هیچ نەبێت تۆزی گوناهی خواردنەوە لە ئەوەی کوشتن سووکترە... عەولاش ئەو بەیانییە کە هەستایەوە، پوختە خۆی لە گەرماوە گشتییەکەی ناو بازار شووشت، لە گەڵ دەستی خۆی خواردنی هێنا، چایەکەی ئامادەکرد، کەرستەکانی لە سەر سفرە رایخست و بانگی هەردووکیانی کرد، هەردووکیان بە تەوەزەلی لە شوێن خۆیان قیت بوونەوە، بە تەریقبوونەوە ماوەیەك چاویان تێکبڕی، بێ دەم و چاو شووشتن، بە خۆخشاندن خۆیان گەیاندە سفرەکە و بە شەلوخاوی بەرامبەری دانیشتن، ئارەزووی خواردنیان نەبوو، هەردووکیان پیاڵە چایەکەیان هەڵگرد و هەنگاوێك لە سفرەکە بە خۆخشاندن دوورکەوتنەوە، پشتیان دایەوە دیوارەکە و جگارەکانیان داگیرساند، خۆنەویستە هەردووکیان رووداوە پڕ خەوشەکەی منداڵیان هاتەوەبیر، کاتێك هەردووکیان لە تەمەنی یانزە ساڵی لە گەڵ مام مەجید سەردانی گوندێکیانْ کرد و لە ناو بەستاوەکە بۆ شووشتنی ئوتومبێلەکەیان وەستان، هەردووکیان

لە گەڵ شووشتنی جێبەکـە، بـە رووتـی مەلـەوانیان دەکـرد، کاتێـك مـام مەجیـد بـۆ سـەراوکردنێك چـەند هـەنگاو لێیـان دوورکـەوتبۆوە، کـت و پـڕ جوتیـار ماسـییەکی بچکۆلانەی گرت، کاتێك هەژاریش ویستی ئەویش ماسییەکی دەستکەوێت و خـۆی لـە دیار گۆماوەکە چەماندەوە، جوتیار ئەو ماسییە زیندووەی کە پڕ بە دەستی بوو، سـەری دا لە قینی هەژار و لە پڕێکدا نیوەی ماسـییەکە نـاودیوی نـاو قینـی بـوو، هـەر کـە هەژاریش لە قیژەی دا، جوتیار بە نەشارەزایی و شپرزەیی ویستی هەڵیکێشێتەوە، بەڵام بە هۆی لووسی ماسییەکە، هەر کە هەوڵی دەدا نینۆکەکانی لێ بـچەقێنێت، سـەرەکەی زیاتر بۆ ناوداوە دەخشی، نیتر جگە لە کلکەکەی، هەموو پارچەکانی تری ناودیوو بـوو، ئەوەك مام مەجیـد بگەڕێتـەوە و نابڕوویـان بـچێت، جوتیـار ناچـار بـوو بـە هـەردوو دەستەکانی، هەردوو لاقینە خڕەکانی هەژار لێککاتەوە و بە ددانەکانی کلکە لووسەکەی ماسی بگرێت و رایکێشێتە دەرەوە، هەڵبەت ماسییە بەستەزمانەکە بەرگەی ئەو کـەش و هەوا بۆگەنەی نەگرت و دەست بەجێ مرد و ناوی لە تۆمارگەی زینـدووەران سـڕایەوە، بەڵام ئەو بەسەرهاتە پڕشەرمە هـیچ کاتێـك لـە مێـشکی هـەردووکیان نەدەسـڕایەوە، هەمیشە لەو جۆرە ساتە پڕشەرمەزارییە دەهاتـەوە بیریـان، ئـەمجارەیان زیـاتر لـە هـەر جارێك، بە جۆرێك بیریان لەو رووداوە هاتەوە، خـەریك بـوون پـەلاماری قینـی یەکـدی بدەنەوە و لە جیاتی ماسی، ئەمجارەیان بەددانەکانیان کرمی ترسـی یەکـدی هەڵکێـشنە دەرەوە... ئێ باشە خۆ سمۆی بەستەزمان بە راشکاوی دانی بەوەنا، کـە ئـەو بـە تـەنیا ناتوانێت پیلانەکە جێبەجێکات، ئەی ئەوە نەبوو دوێنێ رێککەوتن، کە تەنها یەکێکیان لە گەڵ عەولا بخواتەوە و ئەویتریان بە هەر بەهانەیەك، تاکو لە راکێشان و هەڵواسـین و بەستنەوەی عەولا بە خاچەکەوە هاوکاری سمـۆ بکـات، دەبێـت خـۆی لـە خواردنـەوە بپارێزێت... هەر چۆنێك، ئەو دەرفەتەشیان دۆڕاند، دەمەونیوەڕۆ، پـاش دوو کاتـژمێر، هەردووکیان لە باڵەخانەی پەروەردە لە گەڵ کۆمەڵێك شت و مەکی قوتابخانـە هاتنـەوە دەر، عەولاش کە تا ئەو کاتە لە ناو جێبەکە خەریکی هەڵدانەوەی کتێبەکەی بـوو، لـە

سەر داواکاری جوتیار، لە کۆگای ناو گۆڕەپانی حەوشەکە، پاشماوەی پێداویستییەکانی گەیاندە ناو جێبەکە، هەرسێکیان لە پێشەوە سواربوون و لە شار دەرکەوتن، بەرەو ناوچە شاخاوییەکان کەوتنە ڕێ،پاش بێدەنگییەکی درێژەخایەن، عەولاّ:

- دەبوایە سمۆشتان لە گەڵ خۆتان بهێنایە!

هەژار کە لە نێوان جوتیار و عەولاّ دانیشتبوو، لە سەرخۆ:

- ها، ئاخر ئەو ناتوانێت چایخانەکە بەجێبێڵێت.

- ئەی دوکانەکەی تۆ؟

- ئەویان گرنگ نییە، چ داخرا بێت یان کراوە، هەمان شتە، لە کۆمەڵگای ئێمە کاری پەرتووکخانە ڕەنجێکی بێ دەستکەوتە.

- ئینجا بۆ نایفرۆشیت و پارەکەش لە ئاهەنگی زەماوەندەکەت خەرج کەیت؟!

وشەی زەماوەند وەك هێزێکی موگناتیسی بەرەوە ئامێزی پیرە سارای هەڵکێشایەوە، پێش چەند ڕۆژ، بە ئامادەنەبوونی جوتیار، ئێش و ئازاری تەنیایی ناچاری کرد پەنا بۆ فاڵگرتنەوەکەی بباتەوە، تا ئەویش بە شارەزایی خۆی لاپەڕەی ئایندەیەکی دڵکەرەوەی بۆ بخوێنێتەوە و مزگێنی ژنهێنانی بۆ ئاشکراکات، خۆ هەر چەندە دڵی بەو قسەیە زۆر خۆش بوو، بەڵام زۆر بڕوایشی پێ نەبوو، بەڵام خۆ زۆرجاریش قسەکانی دەقاودەق نیشانەکانی خۆیان دەپێکنەوە... بە ڕووخۆشیەوە جگاریەکی پێشکەش کرد و:

- هەمووی نافرۆشم، بەڵام ئەگەر کەسێك هەبێت بەشداریم لە گەڵدا بکات، نیوەی دوکانەکەمی دەفرۆشمێ.

- ئەگەر ڕازیبیت من نیوەی دەکڕم.

- ئینجا تۆ ئەو پارەیەت لە دەستدایە؟

- ئێستا نا، بەڵام کە گەڕاینەوە، بە دڵی تۆ پارە دەدەم.

- کەواتە ئەگەر گەڕاینەوە لە سەر ئەم مەسەلەیە قسە دەکەین، بەڵام ئێستا ڕێگاکە دوورە، واباشە پارچەیەکی تری بەسەرهاتەکەمان بۆ باسکەیتەوە، لە ڕاستیدا ڕابوردوویەکی دڵتەزێنە و بەکەڵکی ڕۆمانێك دێت !!

جوتیاریش، بۆ پاڵپشتی قسەکانی هاوەڵی، لە سەرخۆ:

- بگرە ئەگەر بەسەرهاتەی هەردووکمان لێکبدرێت، شاکارترین ڕۆمانی لێ دروست دەبێ !!

عەولا بە گەرمی:

- لە ڕاستیدا لە گەڵ ئێوە ژیانێکی ترم بینی... ژیان خۆشە... خۆشتر ئەگەر کەسانی وەك من و ئاغا بۆگەنی نەکەن... هیوادارم ئەم بەسەرهاتەم بکرێتە پەندێك بۆ وریاکردنەوەی ستەمکاران !!

جوتیار لە سەرخۆ:

- کوا؟ تۆجارێ چیرۆکەکەت تەواو نەکردووە... ئەگەر هەر ئەوەندە بێ...!؟

عەولا بەهەڵچوونەوە:

- ئینجا من کەی هێشتا تاوانەکانم باس کردوە؟

هەژار لە گەڵ بیرکردنەوەی سەربردە سەیر و سەمەرەکەی دوێنێی لە ناو حوجرەی مزگەوتدا، لە سەرخۆ پێکەنینێکی نەرمی بەردا و بە تامەزرۆیی:

- کەواتە لەم ساتە ڕەخساوتر نابێ بۆ ئەم جۆرە باسانە !

هەر کە جادە قیرەکەیان تەواو کرد، کەوتنە سەر جادە خۆڵەکە و جوتیار ناچاربوو دوو ئەوەندەی پێویست و بۆ زیاتر بیستنی بەسەرهاتەکە، خێرایی لێخوڕینەکەی کەمکاتەوە، عەولاش لە گەڵ داگیرساندنی جگارەیەك:

- ... ڕۆژێك دایکم مابوو گوتی: کوڕم وریای یەکەم هەڵخلیسکانت بە، بێکەسانی وەك ئێمە لە گەڵ یەکەم کەتن توشی لاساری دەبن، بەو جۆرە، شەوان لە بەر تیشکی چراکە لە ئاوێنە دەمڕوانییە خۆم و سەرنجم دەدایە سەر و سیمام... لە دەم و

لێو‌و لووت و گوێچکە و چاو و برۆکانم ورد دەبوومەوە... ئەم چاوانەم لە چاوانی فلان کەس دەچن، کەواتە ئەو دەست پیسی دایکمی کردوە و دەبێ سزا بدرێت و چاوەکانی هەڵکێندرێن... ئەم دەم و لێوانەشم لە دەم و لێوەکانی فلان تاوانبار دەچن و دەبێت ببڕێن... ئەم لووتەشم لە لووتی....... ئیتر لاپەڕەی تاوانبارەکانم هەڵدانەوە، بۆ تۆڵەکردنەوە لغاوی هۆشم خستە دەست دڵەزامدارەکەم... بە پەرۆشەوە دەستم کردە کوشتن وتالان و ئەتك کردن... باوەڕ بکەن جارێکیان، کە بۆ سەردانی هەردوو گۆڕی بنەماڵەم ملی ڕێگای گۆڕستانم گرتبوو، لە پڕێکدا باوکی ئەسرینم لە سەر لێواری بەرزاییەکەی گۆڕستان دیت، لە پاشەوە هێواش هێواش‌لێی نزیك بوومەوە و بە هەموو هێزوتوانایەکم پاڵم پێوەنا و خستمە سەر تاشەبەردەکانی خوارەوە... هەرچەندە لە مردن رزگاری بوو، بەڵام هەردوو قاچەکانی بە جۆرێك شکان و ئێسقانەکانی ورد و خاش بوون، کە هەموو جەڕڕاحەکانی ئیسقان نەیانتوانی سارێژی کەنەوە... ئینجا ئەو شەو لە گەڵ گێڕانەوەی ڕووداوەکە بۆ ئاغا، شەوێکی خۆشمان رابوارد... ئاغا ئەو تاوانەی زۆر پێخۆش بوو، چونکە ئەو پەککەوتنەی ڕێخۆشکەرێك بوو بۆ چەوسانەوەی ئەسرینی بەسەزمان... سەرتان نەیەشێنم بە هەمان شێوە، شەوان لە سەرو سیما و ئەندامەکانی جەستەم ورد دەبوومەوە، پەنجەی تاوانم بۆ کەسێکی تر درێژ دەکرد، پیلانی لە ناوبردنیم دادەڕشت، ئینجا هەر کە دەرفەتێکم بۆ دەڕخسا جی بەجێم دەکرد و.....

هەر کە گەیشتنە بەرامبەر شوێنی شاردنەوەی تفەنگەکان، عەولا گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی راگرت و:

- .... من لێرە دادەبەزم... ئێوەش دەتوانن لێرە بە دڵنیاییەوە بگەڕێنەوە ماڵ... دوایی کە یەکترمان بینییەوە، بەسەرهاتەکە تەواو دەکەین.

هێشتا جیبەکە بە تەواوی نەوەستابوو، عەولا دەرگاکەی کردەوە و خۆی فڕێدا، هەژار بە واقی وڕماو ماوەیەك چاوەکانی بڕییە دەمی جوتیار، کە ئەویش بەهەمان شێوە، سەری خۆی بە سووکانەکەوە نابوو، خەریك بوو ئەو هەموو هەست و ئەستە ئاڵۆزانەی

ناخی، بە قیژانێکی دڵتۆقێنەر دەرخات، هەژار کە شارەزای ئەو جۆرە هەڵوێستە ترسناکانەی جوتیار بوو، بۆ دڵدانەوەی، خێرا ناوڕی لە عەولاّ دایەوە و لە گەڵ پێشکەشکردنی کۆمەڵە کلیلێك کە بە داوێك بەسترابوونەوە:

- ئەوەك پێش ئێمە بگەڕێیتەوە شار.
- نا سوپاس. باوەڕ ناکەم بەم زووانە بگەڕێمەوە !
- خۆ هەر دەگەڕێیتەوە؟!
- ئەی چۆن؟ ئینجا جگە لە ئێوە، من کەسێکی ترم لە سەرانسەر دونیا هەیە؟ پاشان بۆ گرتنەوەی فاڵەکەم دەبێت هەر بگەڕێمەوە.

لە گەڵ دابەزینی ئەمەی گوت و پێکەنینێکی ساختە و بە مانای بەردا، جوتیار بە خرۆشاوی جێبەکەی بە خێرایی لێخوڕییەوە، هەر کە ماوەیەك هەوراز و نشێوی جادەکەیان بڕی، جارێکی تر لە سەر چەقی ڕێگاکە، جێبەکەی وەستاندەوە، بێ دابەزین، هەر لە شوێن خۆی جگارەیەکی داگیرساند و نوقمی خەیاڵەکانی بۆوە،پاش ماوەیەك، لە جیاتی گریان، لە پڕێکدا، پێکەنینێکی شێتانەی بەردا وجێبەکەی لێخوڕییەوە، هەژار کە لەو ماوەیەدا بزواتێکی نەکرد، کەوتبووە نێوان ناڵ و بزمار، لە لایەك ترس و شەرمی لە جوتیار، لە لایەکی تر، سافی ڕێگاکە بە یەکجاری لە سەر دڵی نیشتبوو.

لە راستیدا، هەردووکیان بە حەپەساوییەوە بەرەو لوتکەی بەرزاییەکە هەڵکشان، ئەوەك دەستەیەکی تری جەردە، بۆسەیان بۆ دانابێتەوە، بە دڵەڕاوەکی بە هەورازە سەختەکەدا سەرکەوتن، گەیشتنە سەر چەقی بەرزاییەکە، دارستانێکی پڕ و ئاسمانێکی سامالّ، بەجۆرەها درەختی گوێز و بەڕوو ڕازاندرابۆوە، جوتیار لە جادەکە لایدا و کەوتە ناو بەردەلاّنێکەوە، لە سەر لێوارێکی شاخەکە، جێبەکەی وەستاند، لە هەمان شوێنی جاران، کە یەکەمجاری بوو لە گەڵ مام مەجید سەفەری ئەو گوندەی کرد و هەر لە سەر ڕێگای خۆیان، بۆ بینینی ئەو پاسگەیەی کە لە سەر بەرزایی گردێك نزیك یەکێك لە دێیەکان دروستکرابوو لایاندابوو، دابەزی و هەر لە سەر لێواری شاخەکە پشتی دایە

جێبەکە و دانیشت، ئەو جارە بە کەمتر خەمی رووی کردەوە کۆنە پاسگەکە...
هەژاریش ناچاربوو بە دوودڵی دابەزێت و بەرەو هەمان شوێن بچێت، جوتیار ئەوەندە بە ترس باسی ئەو شوێنەی بۆ کردبوو، کە پڕە لە ورچ و جەردە و پیاو خراپ، ئیتر بە ئەستەم توانی پێیە لەرزۆکەکانی بجولێنێت و خۆی بگەیەنێتە تەنیشتی، هەر بە پێوە کەمێك لە دیار لێوارە رِك و دژوارەکە داهاتەوە و سەیرێکی خوارەوەی کرد، بنی دۆڵەکە دیار نەبوو، سەری سووڕا و دڵی تێکەڵبوو،خەریك بوو بەرەو قووڵایی نهۆڵکەدا سەنگی لە دەستبدات و بەرەو ئامێزی مەرگ بفڕێت، بەڵام جوتیار بە چاوترووکانێك پەلاماری دا و ملی گرت و کەمێك لە لێوارە ترسناکەکەی دوورخستەوە.

لە راستیدا، لێوارێکی ترسناك بوو، بە ئەستەم بنە رِك و چڵکنەکەی دەبیندرا، ئەو جارەی جوتیار لە گەڵ بنەماڵەکەیان لە هەمان شوێن، لە سەر پێشنیاری مام مەجید و بە بەهانەی نوویژکردنی پلە ئایش و خواردنی نیوەرۆژەکەیان، ماوەیەك لەوێ حەسانەوە، ئەو پاسگەیەی نیشاندا، کە پاش رووداوەکە ئەویان بۆ هێنا، پێش بیست و پێنج ساڵ، ئەگەر مەلا سالێح نەبوایە، لەوانەیە چارەنووسی جوتیار دژوارتر دەبوو... پاش رووداوە تاوانە دڵتەزێنەکە، هەر هەمان رۆژ، بە هاوکاری چەند پیاوێکی خێرخواز، لە شەوەزەنگێکدا و بێ ئاگاداری ئاغا، ئەو منداڵە لێقەوماوەیان گەیاندە پاسگەکە، کە چەندین گوند لە دێیەکەیان دوور بوو، دایانە دەستی مام مەجیدی پۆلیس کە چەندین ساڵ بوو یەکدییان دەناسی، ئەو کاتە جوتیار لە ژێر دژواریی باری دەروونی وەك تەرمێك وابوو... لە راستیدا مام مەجید هەر هەمان رۆژ فەرمانی گواستنەوەی بۆ شار پێ گەیشتبوو، دەبوایە رۆژی پاشتر بگەڕیابوایەوە، بەڵام لەبەر ناهەمواری تەندروستی جوتیار، هەر هەمان شەو، سەرەڕای دووری و مەترسی رێگاکە، بەخێرایی گەڕایەوە شارو جوتیاری گەیاندە خەستەخانە، تا لە بوورانەوەکەیشی بە ئاگاهاتەوە، ئەو و ئایش بۆ هەفتەیەك لە گەڵیدا مانەوە... هەر لەو ماوە کورتەش؛ ئایش بە یەکجاری هۆگری

ئەو منداڵە بێکەسە بوو، بۆیە نەیهێشت ڕەوانەی بەشی چاودێری بێ نەوایانی بکەن، بۆ هەڵگرتنەوە و بەخێوکردنی چوونە دادگا و لە سەر ناوی خۆیان تۆمارکرد.

هەر ئەو جارە جوتیار بیری لەوە دەکردەوە، ئەگەر بکرێت عەولاّ لەو لێوارە بەربدرێتەوە، بێگومان دەگاتە سزایەکی دادپەروەرانەی خۆی، بۆیە دواجاریش کاتێك لە ناو بازاڕدا پێکەوە پیاسەیان دەکرد، جوتیار ئەو شێوە کوشتنەیشی خستە بەردەمیان، بەڵام ئەوانی تر هەردووکیان بە بەهانەی سەختی جێبەجێکردن، ئەو پیلانەیەیان ڕەتکردەوە، چونکە هەر وەك سمۆ دەیگوت: چۆن دەکرێت ئەو دەعبایە بەرەو شوێنێکی ئەوتۆ دوور و مەترسیدار پەلکێشکەن؟... ئیتر دووایی بیریان لە خاچدانەکە کردەوە و ئەو پیلانەیان هەر لە بیر چۆوە، بەڵام ئەو بەیانیە لە ناو باڵەخانەی پەروەردەکە، جارێکی تر ئەو پیلانە وروژێنرایەوە، هەر لە ناو ڕێڕەوی باڵەخانەکە، هەردووکیان بەڕێوە چرپە چرپەیان دەکرد، بڕیاریان دا لە کاتی گەڕانەوە، بە هەر بیانۆیەك هەبێت، نەهێڵن عەولاّ تا ئەو شوێنە دابەزێت، ئینجا کە لە سەر لێوارەکەش دابەزین، جوتیار لە دیار لێوارەکە کەمێك سەیری خوارەوە بکات و لە پڕێکدا ئاوڕیان لێ بداتەوە و بە دەنگێکی نزم تێیانبگەینێت، کە چەند ورچێکی زەبەلاح لە خوارەوە دەبیندرێن، هەر کە عەولاّش خۆی لە لێوارەکە نزیك کردەوە و سەیری خوارەوە کرد، دەبێت هەژار بە هەموو توانایەکی، لە پشتەوە هێرشی بۆ ببات و بەرەو تاڵترین چارەنووس پاڵی پێوە بنێت.

ئەو هەر لە منداڵیدا، بەسەدان پیلانی بۆ کوشتنی خودی ئەو عەولاّ یە و تۆڵەسەندنەوەی داڕشتبوو، هەر شەو پیلانێك، بە شێوەیەك، بە شێوازێك، بە ئامێرێك، بە ڕەنگێکی تر، بەجۆرەها کەرستە ئەشکەنجەی دەدا، دەیکوشت و پارچە پارچەی دەکرد و خەیاڵاوی خۆێنی فڕدەکرد، ئەو هەرگیز بەو کەرستەی گەمە جوانانەی قایل نەدەبوو، کە مام مەجید ماوە ماوە، زۆربەی ئێواران لە کاتی گەڕانەوەی لە کرێباریەکانی بۆ ماڵ، لە گەڵ دەستی خۆی بۆی دەکڕی، ئەو هەمیشە حەزی لە بووکە شووشەیەکی ناشرین بوو، بە دزیەوە دەیبردە سەر بانی خانووەکەیان، ماوەیەك بە

دیوارەکەی هەڵدەواسی، بە پەرۆشەوە بەرامبەری دادەنیشت، بە دڵێکی پڕ رق و کینـەوە چاوی تێدەبڕی و ماوەیەك نوقمی ناو بیرەوەریە دڵگیرەکـانی دەبـوّوە، ئـەو هـەر چـەندە سـەردەمی کارەسـاتەکە زۆر منـداڵیش بـوو، کەچـی درِنـدەیی تاوانەکـە بـە جۆرێـك رووداوەکەی لە سەر پەردەی مێشکی داتاشی بوو، کـە بـە روون و ئاشـکرایی تێکـرِای بەسەرهاتەکەی لە بیر بوو، ئەو هەر لـە تەمـەنی منداڵیـدا، گیـانی تۆڵەسـەندنەوە لـە قـووڵایی ناخیـەوەی سـەری هەڵـدابوو و خونـچە و گـەڵاکانی شـادی و خەنـدەیی لێـی سووتاندبوو، ئینجا لە گەڵ یادکردنەوەی ئەو دەستدرێژیە درِندەییە، لە بەرخۆ بۆڵە بۆڵی دەکرد،پەیتا پەیتا، کوتە کوتی دڵی خێراتر دەبوو، بڵێسەی ئاگر لە چـاوانی دەردەچـوو، ئینجا لە پرِێکا بەو چـەقوویەی لـە چێـشتخانەی پلـە ئایـشی دەدزی، دەیقیژانـد و بـە تامەزرۆی هەڵمەتی بۆ دەبرد وپەلاماری دەدا و کون کونی دەکرد و دەم و لووتی دەبرِی و ئینجا ئاگری تێبەردەدا... کە گەورەش بوو بە مێشکی داهـات ئـەو بـە سـەرهاتە لـە چوارچێوەی رۆمانێکی تراژیدی دا بنووسێتەوە، هەژاری هاوەڵیشی وەك شـارەزایەك لـە بواری زانستی دەروونییەوە، بۆ ئەو هەنگاوە نایابەی بـە گـەرمی پـشتگیریی لێـدەکرد، بەڵام بە هۆی سزانەدانی تاوانبارانی ئەو رووداوە، نەیدەتوانی لە لای خۆیـەوە کۆتاییـەك بۆ رۆمانەکەی بنووسێتەوە و مەسەلەکە یەکلایی بکاتەوە، ئەو هەر جار کۆتاییەکی بـۆ کارەساتە دڵتەزێنەی دەنووسییەوە، بەڵام هەر کـە جارێـك یـان دووجـار دەیخوێنـدەوە و پێیدا هەڵدەچۆوە، هەستی دەکرد بەو کۆتاییە تینوێتی رۆحی ناشکێت، ئەو سزایەی بـۆ ئەو دەعبایەی دادەرِشت پرِ بە پیستی بەدکارییەکەی نەبوو، لە گەڵ درِندەیی تاوانەکـەی نەدەگونجا، ئەوەتا ئەمرِۆش بە ئاسانی، رۆژگار نایابترین هەلی بۆ رەخساند، ئەو هەلـەی کە هیچ کاتێك لە نووسـینی رۆمانەکەیـشی بـیری لێ نـەکردبۆوە، ئـەو دەرفەتـەی بـۆ رەخسا، کە هەم چیرۆکە راستەقینەکە و هەم رۆمانەکەی بەدوایی بێنێت... بیری بۆ ئـەو تاوە زێرینەییەی چووە، کاتێك تفەنگەکەی بە تونـدی گرتبـوو، سـێرەی بریبـووە نێـوان هـەردوو چـاوانی، تـەنها یـەك نەرمـە جووڵـەی پەنجـەی سـەر پەلاپیتکەکـە هـەموو

مەسەلەکانی یەکلایی دەکردەوە، ئاخ، چۆن وا بە ئاسانی دەستی لەو تاقە ئاواتە دێرینەی بەربوو؟! دیارە ئەویش وەك لاوازەکان هەر پاڵەوانی خەون و ئەندێشەکانییە... وەك تارماییەك تەنها لە ناو خەونەکانیدا بوێرە.

هەژاریش کە هێشتا دەنگی دڵی دەبیسترا، بە ترس و لەرزەوە، لە تەنیشت هاوەڵەکەی، بە توندی پشتی دایەوە جێبەکە و چوارمشقی دانیشتەوە، بە پەنجە نەرم و لەرزۆکەکانیشی جگاریەکی دەرهێنا و هەر لە فلتەرەوە دایگیرساند، کەوتەوە خەیاڵ و دڵدانەوەی خۆی... ئاخر چ لە بەدبەختی خۆیان و خۆشبەختی ئەو دەعبایە بکەن؟... وەك بڵێیت هەستی بەو تەگبیرەی کردبێت، ئەی بۆچی هەر بەرێگاوە خۆی لە جێبەکە هەڵدا و دابەزی و ئەو پیلانەیشی پووچەڵکردەوە؟!! بەڵام خۆ ئەوجارەیان خەتای ئەوی تێیدا نەبوو؟... خۆ ئەگەر پیلانەکە وەك دارشتنەکەی بەرێوەچوویایە، بێگومان ئەویش ئەوندە غیرەتی تێدا هەبوو، کە بە سەری پەنجەکانی پاڵێکی پێوە بنێت و بۆ هەتا هەتا لە کۆڵی بکاتەوە، پاشان هەر هیچ نەبێت، ئەو بە شارەزایی خۆی، توانی چاوپێکەوتنێکی تری لە گەڵدا دروست بکاتەوە... یەك دووجار بە لاچاوێکەوە سەیرێکی جوتیاری کرد، ئەویش نوقمی ناو خەیاڵەکانی ببۆوە، دوو سێ کۆخەی نەرم گرتی و:

- خۆت دڵتەنگ مەکە، ئەوەتا لە ژێر دەستماندایە و دەربازبوونی مەحاڵە.

- رۆژگار باشترین دەرفەتی بۆ رەخساندم... خۆزگە هەر ئەوجارە بمکوشتایە... ئاخ کە گیانەوەرێکی لاواز و ترسنۆکم !!

- کەس لەو بارە ئاڵۆزە ناتوانێت دوژمنی بکوژێت !!... تازە بە تازە ،ئەو تۆی لە گەورەترین کارەسات رزگار کردبوو، هەر هیچ نەبێت، دەبوایە ئەو چاکەیەت بۆ قەرەبوو بکردایەوە، ئەوەتا ئێستا یەك بە یەك و ئەویش قەرزار.

جوتیار خەریك بوو بە یەکجاری هەرەس بێنێ و دەست لە تۆڵەسەندنەوە هەڵگرێت، بەڵام لە گەڵ ئەو بەهانەلۆژیکیەی هاوەڵی کەمێك دڵی داهاتەوە... چۆن دەکرێت دەست

لە فرِکردنی خۆینی ئەو ستەمکارە بەردات؟... خۆ هەرچەندە کاتی تاوانەکە منـداڵێکی ساواش بوو، بەڵام ئەو گیانلەبەرەی بەرامبـەری، کـە ئـەویش بـە مـرۆڤ دەژمێردرێـت، ئەوەندە بە بێ ویژدانی بنەماڵەی قەڵاچووکرد، کە مەحاڵ بێت تا مردن لە بیری بـچێت، بۆ گورِدانی ئارەزووی تۆڵەکردنەوە، جارێکی تر کەوتـەوە یادکردنـەوەی کارەسـاتەکە... ئەو دەعبایە بوو، کە دەستی بۆ سەر ژیانە پرِسادەکەیان درێـژکرد، وەك سـەگێکی هـار پـەلاماری دایکـە بـێ چـارەکەی دا و داوای داوێـن پیـسیی لێکـرد... لـە گـەڵ ئـەو بیرکردنەوەیە، گیانی تۆڵەسـەندنەوەی وروژایـەوە، ئـەوەك رارِا بێتـەوە، خێـرا ئەڵقـەی داڵغەکەی پچرِاند و هاتەوە گۆ:

- بەڵام دەبێت پێش کوشتنی، خۆمی پێ بناسێنمەوە.

- ها، ئا، قەیناکە، بەڵام وریابە، بانەم هەنگاوە بۆ پاش بەستنەوە و هەڵواسینی بێت!!

•

بە دەم گۆرانییەوە، زۆربەی زۆری خەڵکەکە، بە هەرەوەزی لە تازەکردنەوەی باڵەخانەی خوێندگاکەیان بەخۆڕایی بەشداریان دەکرد، بە تایبەتی حاجی هەمزە کە زیاتر لە هەرکەسێك پەرۆشی کردنەوەی خوێندنگاکە بوو، هەر رۆژە و بەرخێکی قەڵەوی بۆ پاڵەکان سەردەبڕی و بەگەرمی دەیگوت: نەزانین لە ژین هەوێنی دەردە - بناغەی ژان و ئازاری کوردە... ئەو یەکەم کەس بوو لەو گوندە، کە بوێرانە رووبەڕووی ئاغا بووەوە و کوڕە تاقانەکەی پاش تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی رەوانەی شاری کرد، تاکو هەر لە وێوە خوێندنی خۆی تەواو بکات... ئەو کاتی منداڵیی، هەر چەندە لەلایەن باوکیەوە، تاکو خوێندنی خۆی تەواو بکات، رەوانەی گوندێکی تر کرا، بەڵام هەمووی دوو هەفتەی نەخایاند وبە هۆی هات و هاواری دایکە بە سۆزەکەی کە دەترسا لەو هێنان و بردنەی رۆژێك توشی کارەساتێك بێت، وازی لە خوێندن هێنا...

قادر ئاغاش هەر وەك باوکی، تاکو هەر خۆی سەر پشك بێ، رازی نەدەبوو، کەس ئەو کەلە زەنگە لێبدات، ئەو هەنگاوە بهاوێژێت و منداڵەکانی بۆ تەواوکردنی خوێندن هان بدات، دەیگوت: منداڵەکان مەنێرنە شار، خەڵکی شار هەموویان کۆمینستن و رۆڵەکانتان گومڕایی دەکەن... ئەگەر بیزانیبوایە کەسێك ئەو نیازەی هەیە، داوای لێدەکرد کوڕەکەی بۆ بنێرێت، تاکو شوانی یان بەرخەوانی یان قازەوانیی بۆ بکات، بەڵام حاجی هەمزە سەرەڕای ئەوەش، هەر سوربوو لە سەرناردنی کوڕە تاقانەکەی تا جارێکیان بە رووداوێکی نائاشنا لە ناوچوو، سەرجەم بەشداران زیاتر لە بەر خاتری ئەو کابرایە و یادی کوڕە جوانەمەرگەکەی، بە جۆش و خرۆشی کاریان دەکرد، بە بەزەیی دەیانڕوانییە ئەو پیرە بە ساڵاچووە، کاتێك بە گەرمی بەردی دیوارەکانی هەڵدەگرت و دەیخستە بن دەستی وەستا و جار و باریش بە دزیەوە فرمێسکێکی دڵتەزێنی لە چاو دەهاتە خوار.

مام مەجید بە بەهانەی چاتێکردن، زۆربەی کاتەکان لە تەنیشت مەلا سالّح بەرامبەر سەماوەرەکە دادەنیشت و ماوە ماوەش بە دەنگێکی نزم یەکدییان دەدواند و رابردووە سەیر و سەمەرەکانی مەیخانەکەی مام میخۆیان یاددەکردەوە، ماوەیەکی دوور و درێژ بوو، مام مەجیدی پۆلیس و مەلا سالّح هاوەڵی یەکدی بوون، زۆر جار بێئاگاداری خەڵك، بە خواردنەوە شەوەکانیان رادەبوارد، هەموو سەرە مانگانیش کاتێك مەلا بۆ وەرگرتنی ئەو مووچەیەی ئاغا لە رێگای هاوەڵانی کاربەدەست بۆ بژێوی ژیانی، وەك خزمەتکاری مزگەوت بۆی دابین کردبوو، سەفەری شاری دەکرد، لە مەیخانەکەی مام میخۆ، پاش ئەوەی جل و بەرگی خۆی دەگۆڕی، بە یەکەوە دادەنیشتنەوە، درەنگی شەویش بە نیمچە سەرخۆشی دەگەڕانەوە ماڵ و بە دزی ئایش لە سەر دیواری حەوشەکە خۆیان ئاودیوی ژوورەوە دەکردەوە، یانیش هەر نا، لە ناو جێبەکە دەخەوتن... هەزار تاخمە چایەکی بۆ خۆی و جوتیار و حاجی هەمزە بردە سەر بانی خوێندنگاکە، جوتیاریش جگارەیەکی پێشکەشکی حاجی کرد وبۆی دایگیرساند و:

- مام حاجی تا ئێستا هۆی رووداوەکەی جوانەمەرگ ئاشکرا نەبووە؟

- کوڕم خۆ مەسەلەکە ئاشکرایە، بەڵام من بەڵگەی ئەوتۆم لە دەست نییە، تاکو تۆڵەی بسێنمەوە، ئەوانەی جێگای گومانیشن، سەد هەزار سوێند و تەڵاق دەخۆن و نکۆڵی دەکەن.

ئەو هەوڵەی هەردووکیان، لە پیلانیکی تر دەچوو کە لە مێشکیان گەڵاڵەی کردبێت بۆ لە ناو بردنی عەولا، دوێنی کاتێك پێکەوە لە ئاوەدانیەکە دوورکەوتنەوە و سەردانی گۆرستانەکەیان کرد، هەر کە گەیشتن ماوەیەك لە نزیکیەوە راوەستان، جوتیار ئاخێکی گەرمی هەڵکێشا و پەنجەی بۆ هەردوو گۆڕەکە درێژکرد، بە هەست و هۆشێکی ئاڵۆز لە گۆڕەکان نزیك بۆوە، لە ناوەندی هەردووکیان، ئەژنووی خستە سەر زەوی، هەر دەستێکی لە سەر کێلی گۆڕێکا دانا و کەوتەوە دالغە و یادکردنەوە، چاوانی پڕبوون لە فرمێسك...پاشان بەرەو کۆنە هەوارەکە رۆیشتن، لەبن دار گوێزەکەی رۆخ کانییەکە

دانیشتن، جوتیار لە چواردەوری خۆی وردبوّوە و هەناسەیەکی خەمۆکیی هەڵکێشا وگوتی: ئا لێرە بەرامبەر ئەم کانییە رەشماڵەکەمان هەڵدابوو، لەم دارگوێزەش جۆلانەیەکیان بۆم هەڵواسیبوو، ئا لەو لاشەوە دایکم جاروبار مەشکەکەی دەهەژاند... ئاخ کە سروشتێکی جوان و خەمۆکییە !!...لە راستیدا سروشتێکی سەرسورهێنەر بوو، ئاو و هەوایەکی بێگەرد، پاوەنێکی زۆر و لەوەڕێکی زەوەند، لە سەر قسەی خەڵکانی ناوچەکە، دەڵێن گوایە پاش رووداوەکە، هەندێ خاوەن مەڕ و ماڵات هەوڵیان داوە هەوارەکانیان لەو شوێنە دڵڕەفێنە هەڵدەن، بەڵام شەوانە گوێبیستی قیژەیەکی ترسناك بوونەتەوە، ئیتر لە ترسان ئەو ناوچەیەیان چۆڵ کردووە... بگرە بە رۆژیش، شوانەکان ئەوێراون مەڕو ماڵاتیان لەو شوێنە ترسناکە بچەرێنن، ئیتر هەروا بە خاپووری ماوەتەوە. جوتیار، کە بەیەکجاری نوقمی ناو بیرەوەریەکانی ببۆوە، ماوەیەکی درێژ لە هەرچوار دەوری وردبۆوە، ئینجا رووی کردەوە هەژار کە بێتاقەتیی پێوە دیار بوو، بە هێمنی هەستایەوە و دەم و چاوی لە کانیاوەکە شووشت، لە سەر تاشە بەردێك دانیشتەوە، ئاخێکی تری قووڵی هەڵکێشایەوە... بەداماوی سەیرێکی دەوروبەری خوێ کردەوە و بە نیمچە توڕەیی: هەمیشە رۆحەکانیان ئازارم دەدەن و گیانی تۆڵەسەندنەوەم دەوروژێنن، بە راستی ژیانیان لێ تاڵ کردووم، هەندێك جار هەست دەکەم کە رقم لێیان دەبێتەوە، ئەوان جگە لە ئێش و ژان چ میراتێکیان بۆم بە جێهێشت؟ خۆیان هەر لاواز و منێکی لاوازیشیان لە دوای خۆیان بە جێهێشت، هەر هیچ نەبێت با پاش مردنیان وازم لێ بێنن... لە گەڵ بیستنی ئەو قسەیە، هەژار ئەو دەرفەتەی بە هەلزانی و بە گەرمی: پاشان خۆ ئەم سەگبابە تەنها دژی ئێوە تاوانی نەکردووە، بۆ هەردەبێت ئێوە سزای بدەن؟ با کەسێکی تر بەم کارە هەستێت، راستە ئەو بکوژی دایك و باوکتە، بەڵام لە بیریش نەکەی، کە تۆی لە مردن رزگارکرد... ئەمەیان دانپیانانێك بوو بەلاوازی خۆیان، ئیتر ئەوان هەر لەو رۆژەدا، بڕیاریان دا مافی تۆڵەکردنەوە وەك دیارییەك پێشکەشی ستەمدیدەیەکی تر بکەن، هەڵبەت جگە لە حاجی کەسێکی تری بوێرتریان چەنگ

ئەكەوت... بۆیە ئەو رۆژە هەردووكیان هەر یەك لە تەنیشتێكی دانیشت، بە شارەزایی خۆیان، خەم و خەفەت و كەسەرەكانی رابووردوویان لێ دەوروژاندەوە، وەك منەتێكیش ئەو نێچیرە چەورەیان پێشكەش دەكرد:

- باشە هیچ لێكۆڵینەوەیەك نەكرا؟

- ئینجا لێكۆڵینەوە لە گەڵ خاوەن دەسەڵات چ ئەنجامێكی دەبێت؟!

- باشە جوانە مەرگ و عەلاوەدین بۆچی رقیان لە عەولاّ بوو؟!

- ها، نا، ئەوان رقیان لە ئاغا بوو، عەولاّ و دایكە رەحمەتیشی وەك دوو كوێلەو كاربەدەستی ئاغابوون... بەلاّم ئەم پرسیارانەتان بێ ئەگەر نییە !!

- ئەگەر رووبەڕووی عەولاّت بكەینەوە؟!

- سوودی نییە چونكە ئەویش نكۆڵیی دەكرد.

- ئەگەر ناچاری كەین هەموو راستیەكانت بۆ ئاشكراكات؟

- ئاخ بۆ ئەو رۆژە !!

ئەوەك منداڵەكان لە وەرزی خوێندنیان دواكەون، چەند رۆژ بوو، تا ئێوارەیەكی درەنگ دەستیان لە كاركردن هەڵنەگرت، بەلاّم ئەو رۆژە هێشتا لە گەرمەی كاركردنیان دابوون، كاتێك لە گەڵ قیژە و هاوار هاوارێكی تۆقێنەر، دەستیان لە كار هەڵگرت و لە گەڵ سەرجەم خەڵكی لادێ بەرەو سەرچاوەی دەنگەكە بازیاندا و بە هاوارەوە چوون... ئەوانیش هەردووكیان تەبای خەڵكەكە، بە شپرزەیی خۆیان گەیاندە شوێنی رووداوەكە... لە ناو حەوشێكی بێ سەر و بەر، بەرامبەر دیمەنێكی جەرگبڕ راوەستان... كۆمەڵێك ئافرەت لە دیار تەرمی كچێكی سوتێنراو شیوەن و گریانیان بوو، كچەكان بە سەختی دەگریان و پیرەژنەكانیش هەندێكیان ماوە ماوە بە بەزەیی سەیری پیرەمێردێكی پەككەوتوویان دەكرد، كە وادیار بوو، بە خۆخشاندن خۆی گەیاندبووە پەنای دەرگاكەی دەرەوە، بە رووخسارێكی خەمۆكی دەیڕوانیە جەستەی كچە بەستەزمانەكەی، دووانیش لە ژنەكان، بە سووكی چاویان تێبڕیبوو و بە چرپە چرپ یەكتریان دەدواند و:

- قوربەسەرە، هیچ ڕێگا چارەیەکی تری نەبوو !!

هەژار  کە خەریك بوو بە هۆی بۆنی جەستە سوتێنراوەکە بڕشێتەوە، چەند هەنگاوێك لە حەشامەتەکە دوورکەوتەوە وهاوارێکی لە خەڵکەکە هەڵدا و بە شپرزەیی:

- بۆ وەستاون؟!

ئەو قسەیە، سەرنجی سەرجەم ئامادەبوانی ڕاکێشا... گشتیان بە سەرسامیەوە چاویان بڕیە هەژار و چاوەڕێ تەواوکردنی قسەکانی بوون، ئەویش بە لەخۆبایی:

- خێراکەن تا بیگوازینەوە خەستەخانەی شار و....

چەکدارێك کە لە پیاوانی ئاغا دەچوو، نەیهێشت قسەکانی تەواو بکات، بە زەردەخەنەیەکی دەستکردە لێی نزیك بۆوە  و بە سووکی لە سەر و سیمای وردبۆوە و:

- ئینجا گێلە خەستەخانە کەی مردووەکانی زیندوو کردوتەوە ؟!

ئەمەی گوت و ئاوڕی لە خەڵکەکە دایەوە و لە شوێنەکە دوورکەوتەوە، هەر بە ڕێگاوە  بەکەمتەرخەمی، درێژەی بە قسەکانی دایەوە:

- درەنگە، تا تاریك دانەهاتووە،خێراکەن تا پێرابگەین بینێژین.

لە گەڵ ئەو قسەیە، خەڵکەکە بڵاوەبووە، هەر یەك بەرەو ئەنجامدانی پێداویستیەکی داب و نەریتی ناشتن ملی لایەکی گرت، ئافرەتەکان بۆ شووشتن تەرمەکەیان بۆ ژوورێك گواستەوە، پیاوەکانیش بەرەو گۆڕستانەکە کەوتنە ڕێ  و لە گەڵ دەستی خۆیان بێل و پاچەکانیان هەڵگرت، حاجی هەمزە رووی کردە جوتیار و لە سەرخۆی:

- فەرموو مامۆستا پێشمان کەوە، با ئێمەش بەرەو گوڕستانەکە بچین.

لە گەڵ ئەو داخوازیە ڕالێنەبینراوە، جوتیار خۆنەویستە رووی کەوتە هەژار و ئینجا هەردووکیان پێکەوە بە شەرمەزاری ڕوویان کردە مام مەجید و مەلا ساڵح بەلکو ڕێگا چارەیەکیان بۆ بدۆزنەوە، کەچی ئەوان لە گەڵ ئەو داوایە بەدزییەوە زەردەخەنەیەکیان بەردا و لە گەڵ خەڵکەکە کەوتنە ڕێ، ناچار ڕوویان کردەوە حاجی هەمزە و بە بەهانەی

ئەنجامدانی چەند کارێکی تری قوتابخانە داوای لێبوردنیان کرد و مۆڵـەتیان وەرگـرت و بەرەو ماڵەوە گەڕانەوە، هەژار هەر بەڕێوە و لە سەرخۆ:

- هەر ئەمەیانم لێ کەم بـوو، سـەیری مرۆڤێـك بکـەم، کـە چـۆن دەیخەنـە نـاو چاڵێکەوە، ئینجا خۆڵبارانی دەکەن و پوختە دەیپەستنەوە !!

- ........

وا دیار بوو جوتیاریش بە هەمان شێوە بیری دەکردەوە، بۆیە قـسەی تـری نـەبوو تـا بیکات، بە بێدەنگی بەرەو ماڵەوە گەڕانەوە، هەر کە گەیشتن، سەرەڕای کەش و هـەوای ساردی ناوچە شاخاوییەکە، قورگیان بە یەکجاری وشك ببـوو، خـەریك بـوون لـە تێنـان بخنکێن، خێرا دەمیان دایە بەر حەنەفی تانکیە ئاوی نـاو حەوشـەکە و ئـاوێکی زۆریـان خواردەوە، بەرامبەر ئاوەدانیەکە، ئانیشکیان دایە دیـواری حەوشـەکە، بـە حەپەسـاوی سەیری گوندە چۆڵ و هۆڵەکەیان دەکرد، نوقمی ناو بێدەنگییەکانیان بوونەوە، هەژار کـە بە یەکجاری ترسێکی نادیار لە سەر رووخساری نیشتبوو، لە سەرخۆ و بە تووڕەیی:

- تۆ بۆ عەولاّ هاتیە ئەم دێیە...کە ئەویش لێـرە نـەما، ئـیتر تـەواو، بـە هـەر بەهانەیەك ئێرە بەجێبێڵە و بگەڕێوە شار !

-

پلە نایش، کە ئەویش تەبای ژنانی گوندەکـە بـەرەوپیری ئـەو بەسـتەزمانە هـاواری بردبوو، لە ژێر گرانی سەنگی جەستە قەڵەوەکەی، بە ئاستەم بەرەو ماڵەوە دەگەڕایـەوە، هەر کە گەیشتە ناو حەوشەکە، بە پەلەپەل خۆی گەیاندە ژوورەوە وپـاش ماوەیـەك، بـە هەناسە سواری دەرکەوتەوە و لە تەنیشتیان بە هەمان شێوە راوەستا و بە رووخـسارێکی خەمۆکی:

- ئەوەك دۆغەواکەم بسووتێت، خێرا گەڕامەوە... نازانم ئەم خەڵکە چۆن دەستیان دەچێت خۆیان بسووتێنن؟!

هەژار بە پێـودانگی رەوشـتی پیـشەگەریە دەروونزانیەکـەی، گـیرودەی ئـەو جـۆرە پرسیارانە بوو، خۆنەویستە بە رووگەشی رووی کەوتە پلە نایش و بە پەرۆشی خەریك بوو هەر هەموو ئەو بیردۆز و بۆچونانەی باس لە هۆکارەکانی ئەو دیـاردە ترسـناکە دەکـەن، یەك لە دوای یەك و بە تێروتەسەلی بۆ پلە نایش راڤەیان بکات و کارامەیی خـۆی لـەو بوارەدا بسەلمێنێت، بەلام هەر کە جوتیار دەستی لە سەر ملی دانا و بە سووکی گوتی:

- دەزانی جەنابی دوکتۆر؟ من دلنیانیم، بەلام وای بۆ دەچم، مـرۆڤ چـەند ئـاقلتر بێت ترسنۆکتر دەبێت!!

ئیتر لە گەل ئەو لێکدانەوەیە دەمکوت بوو، تا ئێوارەیەکی درەنگ، کـە هـەموویان بە دلەراوکێ و ئاشۆ لە دەوری سفرەکە گلێربوونەوە، هەردوو هاوەلەکە لە ژێر کاریگەری خەم و خەفەتی رووداوە دلتەزێنەکە گەشکەییان گوتبوو، هێشتا سەدای هات و هـاواری ژنان لە مێشکیان زرنگەیان دەدایەوە، بۆ ماوەیەك متەقیان نەکرد، مام مەجیـد ناچـار بوو بۆ خۆشکردنی کەش و هەوا غەمگینەکە:

- داخم ناچێ، دۆغەواکە بۆ من نییە، ئاگام لێبوو بەیانی جوتیار دەیگوت: دلـم دەچێتە دۆغەوا.

پلە نایش کە دیاربوو ئەویش هێشتا لە ژێر کاریگـەری کارەسـاتەکەدا بـوو و رۆژی هەستان و ئەشکەنجە و ئازاری ناو گـۆری هاتـەوە بـیر، بەتورەییـەوە، رووی کـردە مـام مەجید و:

- تۆجارێ واز لەم قسە پووچانەت بێنە و هەستە نووێژێك بکە، بەلکو خـوا لێـت خۆش بێت، نازانم ئێوە پیرە پۆلیسەکان بۆ ئەوندە رقتان لە نووێژە؟

- پیرێژن ئێوە وەك توتی نوێژ دەکەن و هیچی لێ تێناگەن... ئەگەر بەقـەد مـن راستییەکان بزانن...

هەر ئەوەندەی گوت و لە پرێکا قسەکەی پچراند، بە روالەت دیاربوو کە شتێك لـە ژێر سەری داهەبوو تا بیدەرکێنێت، ویـستی بـە راشـکاوی هـەموو گومانـەکانی دلـی هەلرێژێت، بەلام ئەو جارەیش هەر ناچار بوو دان بە خۆی بگرێت و بۆ خۆی گلی داتـەوە و لە جیاتی ئەوەش، هەردوو برۆی هێنایەوە یەکدی و بە گرژی چاوێکی بریە جوتیار و:

- ئەی خۆزگە منداڵێکی ترمان دەبوو، ئینجا ئەو ساکە کیلۆی جوتیار بە چەندبوو؟

پلە ئایش بەهەڵچوونەوە، حەیتاندی و:

- خۆم و سەد منداڵی ئەم سکە قوربانی جوتیار دەبین.... بەس خۆزگە ئەم دەردەی چارەسەر دەبوو.

جوتیار کە لە تەنیشت پلە ئایش دانیشتبوو، بۆ دڵدانەوەی، دەستی لە ملی کرد و بە روویەکی خۆشەوە:

- ئێ دایە خۆت ئاگات لێیە، لەوەتەی هاتووینە ئەم گوندە، زۆر باشترم !

هەژار لەگەڵ قووتدانی کفتەیەك، لێوەکانی لووستەوە و بە پەرۆشی سێ چوار کفتەی تری گواستەوە ناو قاپەکەی و:

- لە وەتەی ئێوە هاتوونەتە ئەم دێیە، هێشتا زادێکی گەرمم تام نەکردووە، باشە مام مەجید بۆ بێ دەرەتانێکی وەك منیش ناکەنە کوڕی خۆتان؟

- تۆ جارێك بوەستە تا زرباوکت دەمرێ !

تریقەی پێکەنینێکی گەرم بەرز بۆوە و خەمی خۆسووتاندنی کچە جاحێڵەکە درا لە بادا...تا درەنگی شەو هەژار و مام مەجید بە کێشمە کێش سەرقاڵی دامەکردن بوون... جوتیاریش لە سەر هەمان نەریتی جاران، پەڕەکانی لە دەلاقەکەدا دەرهێنا کە ماوەیەك بوو تۆزیان لێ نیشتبوو و خەریکی نووسینەوە و دڕاندنی پەڕەکانی بووە...

پلە ئایش کە لە ئێوارەوە چاپەستی چایەکەی نوێ دەکردەوە، بە روویەکی خۆشەوە سەیرێکی هەژاری کرد و:

- دەزانی دوکتۆر؟ لەوەتەی هاتوینە ئەم دێیە، ئەو پەڕانەی جوتیار دەیدڕاندن ئێستا کەمترن لە جاران؟!

- هیوادارم لەگەڵ چاکبوونەوەی بگەڕێنەوە شار.

جوتیار بەهەڵچوونەوە:

- ئەی قوتابخانەکە؟

- با کەسێکی ئەم ناوچەیە بەڕێوەی ببات.

مام مەجید بە پێکەنینەوە:

- نەك هەر لەم دێیە، بگرە دەوروبەریشی بنوارن، کەسێکتان وەچەنگ ناکەوێ قۆناغی سەرەتاییشی تەواو کردبێ.

ئەمەی گوت و لە گەڵ گواستنەوەی داشێکی تری دامەکە، نەوەك پلە نایش کە ئەو کاتە ئەوانی جێهێشت و لە ژوورەکەی تر خەریکی شووشتنی قاپەکانی بوو بەدیارکەوێت، ئاورێکی لە دەرگاکە دایەوە و هەر کە دیار نەبوو، بەتامەزرۆیی:

- نای بۆ بتلێك شیری شێر.

لە گەڵ ئەو داخوازییە، هەموویان بیریان لە مام میخۆ و مەیخانەکەی کردەوە، نای ئەگەر بۆ ئەو ساتە دڵتەزێنە، بتلێك عارەقیان پێبوایە، دواجار جوتیار لە گەڵ هەژار و سمۆ لەناو هوڵە قەرەباڵغەکەی ئەو مەیخانەیە دانیشتبوون، هەر کە مام میخۆ بە سەختی توانی مێزێکیان بۆ دابین بکات، بەجۆرەها خواردن و خواردنەوە بەردەمیانی رازاندەوە، بە شەرمەزاری دوو بتڵی خستە ناو کیسێك و رووی کردە جوتیار و گوتی: ببورە مامۆستا، ئەمەشیان دیاری منە بۆ جەنابتان، نەوەك لەوێ پێویستیت پێبێت...

بەڵام ئەو قایل نەبوو بتڵەکان وەرگرێت، ئێستاش لەو ناوچە شاخاوییە کە زیاتر لە هەر شوێن و کاتەکانی ژیانی، پێویستی بە خواردنەوە هەیە، کەچی یەك مەیخانەشی لێ دەستناکەوێت، مام مەجید، بە ترسەوە ئاورێکی لە دەرگاکە دایەوە و لە سەرخۆ:

- مرۆڤ تا لە ژیاندایە، دەبێت هەمیشە هەوڵی شادی و بەختەوەری بدات، کچ و شەرابیش لوتکەی خۆشی و کامەرانین، کەچی لە کۆمەڵگای ئێمە دەخۆیتەوە ناخۆیتەوە هەر چایە، کچیش بخوازیت و نەخوازیت هەر ئایشە!

هەژار لە گەل قاقای پێکەنینێکی تر، داشێکی دامەکەی گواستەوە و بە رژدی رووی کردە جوتیار و:

- بەخوای باوکێکی خۆشت هەیە!

- ئاخر ئەگەر ئەویش باوکی راستەقینەم بووایە، بە شەقا زللە لە مەیخانە پەلکێشی دەرەوەی دەکردم و نەیدەهێشت لە گەڵیدا مەی بنۆشم.

مام مەجید لــە گــەڵ داگیرســاندنی جگارەیــەك و گواســتنەوەی داشــێکی تــر، بــێ ئاوڕدانەوە:

- بە نەفرەت بێ مەلا ساڵح لە گەڵ ئەو ڕۆژەی دووچاری تۆی کردم، دەبوایە هــەر لێرە ئەلف و بێت لێك جیا نەکردبایەوە، ئێستاش یان شوانێکی بە نــان و ســك دەبــووی یان گاوانێکی پیس و چلکن.

جوتیار ماوەیەك بێ دەنگ بوو، پاشان بە سووکی لە دەم و چاوی هەژار وردبۆوە و:

- خۆزگەم بە شوانێك یان گاوانێك، خۆ هــەر هــیچ نــەبێت چــاو قــایم و نەبــەرد دەردەچووم !!

هەژار لە گەڵ ئەو قسە ڕەقانە، لە شــەرمان ســوورهەڵگەڕا ، بــە دوودڵــی ویــستی قسەیەك بکات، بەڵام لە پڕێکا، لەگەل بیــستنی هــاوار و دەنگــی تــەقینێکی زۆر، بــە توندی ڕاچڵەکی و هەموویان لە شوێن خۆیان بــۆ دەرەوە ڕاپــەڕین و گوێیــان بــۆ هــەراو هوریای ناو گوندەکە هەڵخست... پێدەچوو کەسێکیان ڕاو دەنا، لە لایــەك، قرچــەقرچ و تەقە تەقی تفەنگەکان و لــەولاتر قیــژە قیــژ و هــاوار و گریــان، ئاژاوەیــەکی ترســناك سەرانسەر دێیەکەی گرتەوە... جوتیار کە ئەو کاتە لە گەڵ بنەماڵــەی لــە دیــار دیــواری حەوشەکە، لە بەر ڕۆشنایی مانگە شەو، سەیری خەڵکە سادەوساکارەکانی دەکــرد، کــە بە شپرزەیی بەرەو ماڵی ئاغا ڕایاندەکرد، بە ئاستەم توانی گەنجێکی دێیەکە ڕابگرێت و:

- وادیارە کارەساتێکی تر ڕووی داوە؟!

گەنجەکە لە گەڵ ئاوڕدانەوەیەکی دەوروبەری، لە دیوارەکە نزیــك بــۆوە و وەك دەڵــێن شەکرە خەندەیەکی بە سیماوە دەرکەوت، بە دەنگێکی نزم و بە پەرۆشەوە:

- واتەواتێك لە ئارادایە، گوایە ئاغا کوژراوە !!

-٨-

بەرەبەیان لە گەڵ قیژە و هاوارێکی ترسناك، جارێکی تر مام مەجید و پلە ئایش لە خەودکانیان راپەڕینەوە و بە دەنگ جوتیارەوە چوون، بـەڵام دیـار بـوو، نـەوجارەیان لـە جیاتی جوتیار، رەشەخەونەکە سواری سینگی هەژار ببوو، بە ترس و لەرزەوە، لە شـوێن خۆی قیت بۆوە، پەلاماری پەرداخە ئاوەکەی دەستی پلە ئایشی دا و بیّ بسمیللا تا بنی نـەهێنا بـەری نـەدا، دەتگـوت لـە رۆژی حەشـرا گەڕاوەتـەوە، رەنگـی بـەرەو زەردی هەڵگەڕابوو، مـام مەجیـد دەسـتی گـرت و هـەر لـە بـەر دەرگاکـە، هەنـدێك ئـاوی مەسینەکەی رژانە ناو هەردوو دەستی و ئەویش گەرمایی تـای دەم و چـاوی پـیّ فێنـك کردەوە، بە داماوی و شلەژاوی گەڕایـەوە و بەرامبـەر سـۆپەدارەکە، کـە جوتیـار تـازە خەریك بوو دایگیرسێنێت، بە شەرمەزاری و بیّ بەرزکردنەوەی سەری:

- لە هەموو ژیانم خەونی وا ترسناکم نەبینیوە؟

پلە ئایش، کە لە گەڵ ئەو جۆرە هەڵوێستانە راهاتبوو، بە کـەمتر خـەمی چاپەسـتە ئاوەکەی خستە سەر سۆپەکە و لە سەرخۆ:

- وریابە کوڕم، گێڕانەوەی خەون باش نییە؟

هەژار لە ژێر کاریگەری خەونە ترسناکەکەی، لە بیری چوو، کە ئـەو لـەو مەسـەلانە شارەزاترە و خەونیش یەکێك بووە لەو بابەتانەی لە قۆناغی خوێنـدنی تیایـدا مەلـەوان بووە، بە گێژ و وێژی، سەری لەقاند و:

- خەمت نەبێت، پلە خەونەکە بۆ کەس باس ناکەمەوە.

بەڵام هەر کە مام مەجید و جوتیار لە تریقەی پێکەنینیان دا، هەژار پـەی بـە قـسە هەلەق و مەلەقەکانی کرد، بە شەرمەزاری رووی کردەوە پلە ئایش و بە تووڕەیی:

- رووت سپی بێت پلە ئایش، سەرت لێشێواندم، ئەم قسە هیچ و پووچـانەت لـە کیّ بیستووە؟!

سەرەڕای ئەو قسەیەش، خەونەکەی هەر باس ؛ەکرددوە، جارێکی تر هەستایەوە، لە میانی پەنجەرەکە سەیرێکی دەرەوەی کرد، دنیا خەریك بوو لە گەڵ بانگی کەڵەشێرەکان هێواش هێواش رووناك دەبۆوە، لە خورێنی جگارەیەکی داگیرساند، هەر کە گۆڕەپانی حەوشەکە بە باشی رووناك بۆوە، خێرا جگارەیەکی تری داگیرساند و یەکیتریشی خستە سەر گوێچکەی و بەرەو ئاودەستی حەوشەکە رۆیشت، تا هەردوو جگارەکەی لە ناو ئاودەستەکە نەکێشا نەگەڕایەوە ژوور، چێشتەکەیان خوارد و هەموویان ماوەیەك لە ناو حەوشەکە کۆبوونەوە و سەیری ناو ناوەدانیەکەیان کردەوە، ئاژاوەکە کپتر ببووەوە... خەڵکێکی کەم بە رواڵەتی خەمۆکی،لە نێوان مزگەوت و ماڵی ئاغا بەداماوی هاتوچوویان دەکرد... پلە ئایش لەگەڵ پێچانەوەی پێداویستیەکانی جوتیار، بەهەڵچوونەوە:

- تێناگەم، هەر جارەی بە بەهانەیەك بەجێمان دێڵیت و دەگەڕێیتەوە شار... کەوابێ، بۆ هاتینە ئێرە؟

- دایە خۆت ئاگات لێ یە، قوتابخانەکە کاولکراوە، ئیتر تا رێکبخرێتەوە، دەبێ جارویار پەنا بۆ شار ببەم...پاشان من ناچارم هەژار بگەینمەوە ماڵ !!

ئەمەی گوت وبە پێکەنینەوە ئاوڕی لە هەژار دایەوە، ئەویش ئەوەك جوتیار لە سەفەرەکەی ژیوان بێتەوە، بێ ئەوەی خودا حافیزی لە مام مەجید و پلە ئایش بکات، خۆی تێهەڵدایە ناو جێبەکە و لە پاش جامەکەوە بە زەردەخەنەیەکی دەستکردە، بە هەردوو دەست ماڵئاوایی لێیان کرد، جوتیاریش دەستی دایکی ماچکرد و جانتاکەی بەدەست گرت و لە گەڵ مام مەجید چەند هەنگاوێك لە شوێنەکە دوور کەوتنەوە و چرپێنێکیان کرد و جوتیار بە سەر لەقاندنەوە و گەڕایەوە و سواری جێبەکەیان بوو و بەرەو شار دەرچوون، هەر کە کەمێك لە دێیەکە دووركەوتنەوە، جوتیار لە گەڵ لێخوڕینی جێبەکە، ماوە ماوە، بە لاچاوێك سەیرێکی هەژاری دەکرد، بە تامەزرۆیی چاوەڕوانی گێڕانەوەی خەونەکەی دەکرد، کەچی ئەو لە شەرمان دەمی داخرابوو، تا رووی

نەشکێت، ویستی مەسەلەی خەونەکە نەهێنێتە کایەوە، هەر کە بێدەنگیەکەی درێژەی خایاند، جوتیار خۆی بۆ نەگیرا و لە پڕێکدا پێکەنینێکی شێتانەی بەردا و:

- خەونەکەتم بۆ دەگێڕیەوە، یانیش بە قسەی پلە ئایش دەکەیت؟

بێ ئاوڕدانەوە، بە رووشکاوی، هەژار جگارەیەکی داگیرساند و یەك دوو مژی لێدا، لە جامەکەی تەنیشتی سەیرێکی بەفری سەر چیاکانی کرد، ویستی لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە شەرمهێنەرە هەڵبێت، ئاخر ئەو بە درێژایی چەندین ساڵ، تانە لە جوتیار دەدات، گوایە مرۆڤ نابێت لە خەون بترسێت، بە قسەی خۆی، کە زۆر جار بۆ جوتیاری دووبارە و سێبارە دەکردەوە، ئەو نەك هەر لە خەون، بگرە لە خەونێکی ناو خەونەکانی شتی ئەوەندە ترسناکی بینیوە، کەچی هەر بە خەیاڵیشیدا نەهاتووە و گاڵتەی پیا هاتووە، زۆرجار رێنمایی جوتیاری دەکرد، تاکو لە کاتی بینینی هەر خەونێك، خۆی شپرزە نەکات، دەیگوت: ئەو هەرگیز نە لە خەون ترساوە و نە لە خەونیش دەترسێت...

بەڵام ئای لەو سەگە، جوانی بۆ رەخسا، ناشرینترین خەسڵەتەکانی بۆ ئاشکرابوو، خۆ ئەو لە ترسی خۆی، دیواری حەوشەکەیانی ئەوەندە بەرزکردبۆوە، خەریك بوو خانووەکەی لە دەرەوە بزرکات، دەرگا و پەنجەرەکانی دەرەوەی ئەوەندە قایم کردبوون، مەگەر بە هەموو ئاسنگرانی شارەکەش بکرابوانەوە، سەرەڕای ئەوەش، بۆ زیاتر متمانە و دڵنیایی، بە زۆر سمۆی دەبردەوە لای خۆی، سمۆی بەستەزمانیش بە منەتباری وەك برایەکی بچووك خزمەتی دەکرد و بە سادەیی خۆی رەنجی رۆژانەی چایخانەکەی لەو ماڵە خەرج دەکرد...

ئیتر هەر چۆنێك بێت، لە گەڵ رەچاوکردنەوەی هەموو لێکدانەوەکان، نەیتوانی هەتا سەر خۆی بێدەنگکات و وەڵامی پرسیارەکەی جوتیار نەداتەوە، لە گەڵ ئەو بیرکردنەوەیە بە تیلەچاوێك سەیرێکی جوتیاری کرد... ئەو هەتیووە هەر چاوەڕێی بزواندنی لێوەکانیەتی، خۆ ئەگەر ئێستاش وەڵامی نەداتەوە و ناڕەحتی بکات، سەدا سەد، ئەو هەر وازی لێ ناهێنێت، بە دووری نازانێت، بەرامبەر سمۆ ئەو پرسیارە دووبارە بکاتەوە، ئەو کاتەش هەر بە یەکجاری ئابرووی دەچێت، چونکە ئەو هەمیشە پیاوەتی خۆی بەرامبەر ئەو

بەستەزمانەی لە خۆی ترسنۆکترەی دەنواند. دەکریت بلـێین سمـۆ تاقـە کـەس بـوو، وەك کەسێکی بوێر ڕێزی لیَ دەگرت، هەر چەندە ئەویش هەندێك تێبینیی لە مەڕ مەسـەلەی دیواری حەوش و دەرگا و پەنجەرەکان هەبوو، بەلاَم تا رادەیـەك بڕوایـشی بـە قـسەکانی هەژار دەهات، گوایە ئەوەك بەرۆژ، لە کاتی دەرچوونیان لە مالّەوە، توشی دەرد و بەلاَی دزیکەران بن، بەلاَم خۆ سمۆش، بە دلّ حەزی دەکرد ئەو دەروازانە زیاتر قایم بکرێن، هەر چۆنێك بێت، ئەم هەتیووە نابێت مەسـەلەی ئـەو قیـژە و هـاوارەی بەرخـەونی بـۆ سمـۆ باسکاتەوە، جارێکی تر بە تیلەچاوێك سەیری کردەوە، ئەو چەقاوە سووە خۆ هێشتا هەر چاوەڕێیە، چاکبوو بە جەرگتر نەبوو، راستە لە کـاتی منداڵیـدا زۆر هـار و بـوێر بـوو و هەموو منداڵەکانی هێنابووە حەج حەجانیَ، بەلاَم پاش چـەندین سـالّ و تێکـەلّبوونیان، ئەویش دلّقاییی خۆی لە دەستدا و هەموویان وەك یەك لیَهاتن، خۆ زۆریش وەك یەکنین، چونکە هەر هیچ نەبێت ئەو کارەساتێکی ئەوەندە تۆقێنەری بە سەرهاتووە، کە ناحـەقی نەبێتِ ئەو جۆرە خەونانە ببینێت، بەلاَم ئەو هەر لەو راستە بە خەونێکی درۆ خەریك بوو زەندەقی بچێت، هەر چۆنێك، لە گەلّ کەمێك دەستێوەردان و بە زلکردنی خەونەکـە، بـا بۆی باسکاتەوە... پاش ئەو هەموو لێکدان و شیکردنەوەیە، بە ئاگری هەمان جگـارەی دەستی، جگارەیەکی تری داگیرساند و:

- بەخوای خەونێکی ترسناك بوو !!... شـایی و زەماوەنـدی مـن بـوو، زڕبـاوکم جارجار سەرچۆپیی دەگرت و جارجاریش بـە روالّـەتی مـەلا سـالّح دەهاتـە بەرچـاو و دەستی بە مارە برین دەکرد، شایی و زەماوەندێکی چـۆلّبوو، شـایی و زەماوەنـد بـوو، بەلاَم کەسێکی تری لیَ نەبوو، تەنها زڕباوکم بوو، کە هـەر جـارەو بـە روالّـەتێك خـۆی پیشاندەدا، دیمەنێکی سەیر بوو، لە لایەك دەنگـی دەهـۆلّ و زوڕنـا وهەلّهەلّـەی ژنـان و قاقای پێکەنین، کەچی تەنها زڕباوکم دیاربوو، ئیتر بە هەر شێوەیەك، لە گـەلّ بووکەکـە خۆم لە پاش پەردە دیتەوە، ئەوەی لە هەمووی سەیرتر، لە جیـاتی رەنگـی سـپی، ئـەو بووکە رەشی پۆشیبوو، بـەلاَم سـەرەڕای ئـەوەش، بـەژن و بالاَیـەکی سەرسـووڕهێنەری

هەبوو، دەست و پێیەکانی زۆر سپی و نەرم و نۆڵ بوون، زۆر بە پەرۆشەوە، لە تەنیشتی دانیشتم، دەمارەکانم ئەوەندە پڕ ئاو ببوون، خەریك بوون بتەقنەوە، ئارامم نەما و دەستم بۆی برد تاکو تاراکەی لە سەر لابدەم و دەست لە ملانی بئالێنم، بەڵام هەر کە لاچمکێکم گرت وکەمێك بەرزم کردەوە، چ دەعبایەکم بینی؟!... ژنێکی دەم و چاو سوتێنراو، لە پیرە سارا دەچوو، هێشتا لە هەندێك شوێنی دەم و چاویدا، دووکەڵ بەرزدەبۆوە، پیستی دەم و چاوی پارچە پارچە شۆڕ ببوونەوە و ددانەکانی دەرپەڕیبوون و هەندێکیان دووکەڵیان لێ هەڵدەستا و....

جوتیار کە تا ئەو دەمەش بە ئەنقەست و بە رواڵەتی گرنگی پێدان، گوێی بۆ شلکردبوو، ئیتر زیاتر خۆی بۆ نەگیرا و نەیهێشت قسەکانی تەواو کات لە پڕێکداپێکەنینێکی شێتانەی بەردا و:

- باش بوو، تاکو هەست بە نەهامەتی من بکەیت !

- هەتیو، ئینجا کەی خەونی تۆ ئەوەندە ترسناکە، بە شەرفم، ئەم خەونە لە پیاوەتیی خستم، دەبێت هەر کە گەیشتینە شار سەردانی پزیشکێك بکەم، ئاخر من دەمارەکانم لە ئاوی پیس پڕببوو، هەر کە چاوم بەو دەعبایە کەوت ئاوەکە هەمووی لە شوێنی خۆی وشك بوو.

لە گەڵ ئەو قسانە، لە ناوچە شاخاوییەکە نزیك دەبوونەوە، جوتیار خۆ نەویستە:

- تۆ بڵێی ئەو سەگە لە هەمان شوینی جارانی......

قسەکانی تەواو نەکرد، کتوپڕ سەرێکی زەبەلاح لە جامەکەی تەنیشت هەژار هاتە ژوورەوە، هەژار قیژاندی و جوتیاریش سووکانەکەی لە دەست دەرچوو و خەریك بوو جیْبەکە سەرووژێرکات، بە سەختی توانی بە سەر سووکانەکە زاڵبێتەوە وجیْبەکە بوەستێنێت و بە چاوتروکانێك هەردووکیان لە دەرگای شوفێرەوە دەرپەڕین... عەولاش بەپێکەنینێکی شێتانە لە پاش جیْبەکە هاتە خواردوە و خێرا ئاودیوی پێشەوە بوو...

ئەوانیش پاش ئەوەی کەمێك هێور بوونەوە، ناچار بە رووشکاوی سواربوونەوە و کەوتنەوە رێ... جوتیار بە هەڵچوونەوە:

- تۆ گاڵتەکانیشت لە شێوەی تاوانن !

هەژار، بە بینینی عەولا کەمێك نارام بۆوە، لە گەڵ پێشکەشکردنی جگارەیەك:

- دڵم لەرزی و خەریك بووم لە خۆم بچم !

عەولا، بە قاقای پێکەنینەوە، برە پارەیەکی زۆری لە پاخەڵی دەرهێنا و پێشکەشی هەژاری کرد و:

- ئەمەش نەختی ژنهێنانەکەت !!

- ئەمەیان چییە؟

- نرخی نیوەی دوکانەکە؟

هەژار بە سەرسامی ناوڕێکی لە جوتیار دایەوە و بە دوودڵی پارەکەی وەرگرت، جوتیاریش ماوەیەك بێ دەنگ بوو، پاشان جگارەیەکی داگیرساند و هەناسەیەکی درێژی لێی هەلکێشا و بێ ناوڕدانەوە:

- **تۆ ئاغات کوشت؟!**

پرسیارەکەی کرد و لە گەڵ هەژار گوێیان بۆ وەڵامەکە راتەکاند، عەولاش لە گەڵ خوراندنی سەرە بۆزەکەی، نۆخەیەکی ئاسوودەیی کرد و:

- کە گەورەتر بووم و لە رووخسارم وردبوومەوە، ئەو جارەیان زیاتر لە هەر ئەندامێکی جەستەم، سمێڵەکەم سەرنجی راکێشام، سەرەتا نەبادا بخزێمە ناو دەریای گومانێکی پڕ نەهامەت، ئەو ئارەزووە شەیتانەیەم سەردوخوونی ناو کانگای ناخم کردەوە، بەڵام هەمیشە گرێی پرسیارێك لە ناخمدا تا و نا تاو سەری هەڵدەدایەوە... لە راستیدا، زۆر لە سمێڵە بۆرەکەی ئاغا دەچوو... پەنجەی تاوانم بۆ ئاغا درێژکرد... بەدوو دڵی بیرم لە کوشتنی ئەویش کردەوە... خۆ کوشتنی ئەو ئالەبارە زۆر ئاسان بوو، بەڵام چۆن دەتوانم بێ ئەو بژیم، بە جۆرێك چارەنووسم لەگەڵیدا بەسترابۆوە، ئەو نەما، منیش

نامێنم... لەو ڕۆژەوە نوقمی ناو گەردەلولـەی ئـەو لێکدانـەوە سەرسـوڕهێنەرە بـووم و دوودڵ بووم... چۆن دەکرێت بێ ئاغا بژیم؟... ئـەو هـەموو ژیانـە... هـەموو چـرکە و ساتێکی ژیانم بۆ خزمەتکردنی ئـەو تـەرخان کرابـوو... باشـە، گریمـان ئـەوم کوشـت، بەیانیان بۆ خاتری چاوانی کێ بە ئاگا بێمەوە؟... دڵی کێ لـە خـۆم ڕازی کـەم؟... بـە دڵخۆشکردنی کێ، دڵم خۆشکەم؟... لەوانەیە ئێوە پـەی بـە ئـالۆزی ئـەم مەسـەلەیە نەبەن، کوشتنی ئاغا ژیانی تووشی بۆشاییەکی ڕەها دەکرد، بەڵام هەر کە لە گەڵ ئێـوە تێکەڵ بووم، لە گەڵ ژیانێکی تر ڕاهاتم، لە گەڵ ئازادی، هەرکە فێر بووم کە دەتوانم بـێ ئاغاش بژیم، بڕیارم دا ڕەگ و ڕیشەی ئاغایەتی بقرتێنم، یەکسەر نەخشـەی پیلانـی لـە ناو بردنی ئەویشم کێشا و چاوەڕێ ئەو هەلەیەم کرد، کە دوێنێ شەو بۆم ڕەخسا... مـن کە لە ئێوە دابڕام، تفەنگەکانم فرۆشتە قاچاخچییەك... نـووکی خەنجەرەکـەم ژەهـراوی کرد و هەر بەو ئێوارەیە خۆم لە دەورو بەری ئاغا نزیك کردەوە، کە شـەو داهـات، خـۆم لەناو تەوێلەی ئەسپەکان حەشار دا... لەگەڵ بیستنی خۆکوشتنی نەسـرین... پەرۆشـی بەردانی گریانێکی سەخت بووم، کەچی گریانێکی ئەوتۆ گەورە، لە دەمـارە وشـکەکانی دڵە ڕەقەکەم دەرنەدەچوو... ئای لەو بەسـتەزمانە !... ئاغـا لـە میـانی منـەوە ئـەو خونچەیەی بۆگەن کـرد و هەڵیوەرانـد... کـچێکی شۆخوشـەنگ، فەریکـە بـوو، تـازە پێدەگەیشت، تازە مێینیەکەی بە دیاردەکەوت و لە گەرمەی گەنجێتیی دابـوو، ئەوەنـدە ناسك بوو، بە پێکەنینە دڵڕفێنەکەی مردووەکانی زیندو دەکردەوە... زۆر باشم لە بـیرە، خانمی گەورە سەفەری شاری لە بەر بوو، باشترین دەرفەت بوو، لە سەر زاری ئاغـا داوام لە باوکی کرد، بۆ دڵدانەوەی نازدار، یان نەسرین بنێرێتە لای، یانیش نـازدار ببەنـە لای خۆیان، هەڵبەت ئەو بەسەزمانە تێگەیشت و بەیانی زوو کچە ئەشمیلانەی خۆی گەیانـدە نازدار و تێیگەیاند کە تاکو خانم دەگەڕێتەوە لای بمێنێت، ئیتر هەموو ڕێگاکان بۆ ئاغـا کرانەوە، هەر شەو پاش نووستنی نازدار، دەیبردە ژووری خۆی و بە ئاڵتون و دیاری گران بەها و قسەی زل و بەڵێنی درۆ، ئەو بەسەزمانەی لە خشتە بردوو و لە کچێنیی خـست،

هەڵبەت من خۆم ڕۆڵێکی سەرەکیم لەو تاوانە گێڕا... هەرچۆنێك خۆکوشتنی نەسرین لە ناخمدا لە تەقینەوەی بومبایەك دەچوو، ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە دەروونمی زیاتر جۆش دا... هەلێکی لە بار بوو... شارەزام لەم جۆرە کارەساتانە... پیاوانی ئاغا لە گەڵ ڕاگەیاندنی ئەو جۆرە ڕووداوانە و بۆ ئارامکردنەوەی بارەکە دادەڕژانە ناو ئاوەدانی و ئاژاوەکانیان سەرکووت دەکردەوە... ئەوان بەرەو شوێنی کارەساتەکە دەچوون و دووردەکەوتنەوە، منیش خەنجەرەکەم نیوەکێشکرد ولە سەرچاوەی تاوانەکان نزیك دەبوومەوە... بڵێسەی ئاگر لە چاوانم دەردەچوون، بە پەرۆشەوە ئاخێکم هەڵکێشا و هەموو هێزوتوانایەکم کۆکردەوە و بەهەڵمەتێکی پڕ زەبروزەنگ پەلاماری ئەو دڕندەیەم دا و هەر لە ناو گەرماوەکەیان، نووکی خەنجەرە ژەهراوییەکەم لە دڵە بۆگەنەکەی چەقاند و ورگیم هەڵدڕی.

هەر کە بێدەنگ بوو، هەژار جگارەیەکی پێشکەشکرد و یەکی تری بۆ خۆی داگیرساند و بە حەپەساویەوە:

- من یەك بەخۆم حەسوودی بە ئازایەتی و چاونەترسیت دەبەم، من زۆر جار بیرم لە کوشتنی زڕباوکم دەکردەوە، بەڵام هەمیشە بە ترس و لەرزەوە هەر کە ئەنجامەکانم هەڵدەسەنگاندن، ژیوان دەبوومەوە.

- ئەی ئێستا لە کوێ نیشتەجێن و چ کارێك دەکەن؟

- ئێستا لە... ها... گرنك نییە !... دەزانی کە مامۆستا ڕەشنووسی بەسەرهاتەکانتی نوسیوەتەوە و خەریکە بیکاتە ڕۆمان؟

عەولا بە گەرمی و ڕووخۆشییەوە، سەیری جوتیاری کرد و:

- بەڵام هێشتا تاوانی تر ماون بۆتانی باس کەم !!

جووتیار بە کەمتەر خەمی:

- بەسە ئەوانەی باست کردن و ئەوانەی ماویشن دڵنیام کە هاوشێوەن !!

لەگەڵ هەڵکێشانی ئاخێکی دڵتەزێن:

- تەنها یەکێکیان نەبێت !!
-
- خۆزگە ئەویش لە شێوەی ئەوانی تر بووایە... من بۆ هەموو ئەو تاوانانەی باسم کردوون پەشیمان نیم !!... بگرە بەتاوانیشیان ناژمێرم و لە تۆڵەسەندنەوە دەچوون... تاوانێك نەبێت کە ناخی چیاکان دەلەرزێنێت و بەیەکجاری هەراسانی کردووم و تا ئێستاش لەخەونەکانمدا ئازارم دەدا.
- ئەمەیان چ تاوانێك بوو؟
- ها، نا نا، ئەمەیان پێویستی بە کەش و هەوای خواردنەوەیەکی گەرم هەیە !

- ئەرێ مەلا دەڵێن ئەو ئاغایە گوایە لە سەید زادەکانیش بوو !

مام مەجید کە لە ناو چێشتخانەکە بۆ مێوانەکانی خەریکی ئامادەکردنی قۆرییەکی چایە بوو، بە دەنگێکی بەرز، ئەو پرسیارە ناوەختەی ئاراستەی مەلای کرد، کە لە بارێکی ئاڵۆزدا، بەرامبەر حاجی هەمزە لە دیار تەختەی دامەکە دانیشتبوون، دیاربوو کە داشێکی کەمتر بووە و خەریکە بدۆڕێت، بە تورەیی داشێکی تری بزواند و:

- بێ قەزابی، هەموو شێخ و ئاغا و پاشا و میر و سەرۆکە موسڵمانەکان، تاکو رەوایەتی بدەنە دەسەڵاتیان، رەسەنایەتی خۆیان دەبەنەوە سەر قورەیشیەکان.

وا دیاربوو، ئەو فتوایە،حاجی هەمزەی نیگەران کرد، داشێکی دامەکەی بە دەستەوە بوو تا بۆ خانەیەکی تر بیگوازێتەوە، بەڵام شوینی یەکەمی لە بیرکرد، ماوەیەك لە چوارگۆشەکان وردبووە، هەر کە خانەکەی هاتەوە بیر، خێرا داشەکەی گواستەوە، نەوەك تووشی گومڕابێت و لە ئایین لادات، بۆ گۆڕینی باسەکە لە گەڵ تێکدانی چایەکەی، رووی کردە مام مەجید، کە ئەو کاتە ئەویش لە تەنیشتیان بەرامبەر دامەکە دانیشتبوو و چایەکەی تێکدەدا:

- سەید بێت و سەید نەبێت، ڤیروسیا، گەیشتە چارەنووسی خۆی... من زیاتر گومانم لەو ستەمکارە بوو، بەڵام با بزانین چ لە ناو هەگبەی ئەو زۆڵەشدا هەیە......

ئەمەی گوت و لە گەڵ جووڵانەوەی داشێکی مەلا ساڵح، ئەو لە شێوەی هێرشێکی جەربەزەیی داشێکی تری بردە پێش و درێژەی بە قسەکانی دایەوە:

- لە سەر قسەی باوکی رەحمەتیم، باپیری ئەو ئاغا گۆڕبەگۆڕە، هێشتان دڵرەق و نالەبارتر بوو... دەڵێن پیاو نەبوو لە کاتی پێشکەشکردنی چایە، چاو بنێتە چاوانی و چایەکە نەڕژێنێت.

مەلا سالّح، ماوەیەك بیری لە هۆی قوربانیکردنی داشەکە کـردەوە، بـەلاّم هـەر کـە سەری لە هیچ تەلّەك و پیلانێك دەرنەچـوو، بـە ترسـەوە داشـێکی پێـشکەشکرد و دوو داشی خوارد و داشە دۆڕاوەکەی گەڕاندەوە، بەلاّم پێش ئەوەی لـەزەت لـەو سـەرکەوتنە وەرگرێت، حاجی داشێکی تری پێشکەشکرد و لە جیاتی یەك داشە، سێیانی تری قووتدا و سەنگەرە سەرەکیەکەی مەلای بە یەکجاری تێکشکاند... مەلا بە توڕەیی داشـەکانی سەر لە نویّ ریزکـردەوە، ویـستی گێمێکـی تـر دەسـت پێبکـەن، بـەلاّم مـام مەجیـد نەیهێشت و رووی دامەکەی خستە نێوان خۆی و حاجی و:

- تۆ جارێك بڕۆ لە گەرماوەکە خۆت بشۆ، تـاکو کوونـەکانی بـەدەنت ببنـەوە و مێشکت کەمێك بحەسێتەوە.

لە گەلّ ئەو قسەیە، حاجیش شەرمی شکا و بە تامەزرۆیی رووی کردە مەلا و:

- راستدەکات، مەلا خۆ هەموو خەلّك ئەم گلە و گازندەیـەیان هەیـە، باشـە تـۆ زانایەکی ئایینی، بۆ ئەوەندە رقت لە خۆشوشتنە؟!

مەلا سالّح ئەوەیان یەکەمجاری نەبوو، رووبەڕووی ئەو جـۆرە قـسە رەقانـە ببێتـەوە، بگرە زۆر جار لە سەر فەرمانی ئاغا، بە شێوەی شوشـتنی مـەڕ ومـالاّت، خولاّمـەکان هەلّیاندەدایە نـاو گۆمـە نـاوی رەز و باغەکـە و ناچـاریان دەکـرد خـۆی بـشوات، بـە گالتەجاری دەیانگوت: ئەو چەشنە کرێژە بۆ رەزوباغ لە زبلی ئـاژەلّیش باشـترە، بـەلاّم ئەوجارە پرسیارەکە لە لایەن دوو هـاوەلّی ئـەوتۆ ناراسـتەی کـرا و کـاری تێکـرد، کـە نەیویست لەو تەمەنەدا، ئەوان دلّیان بەرامبەری بێنیّ، ئیتر بۆ ئاشکراکردنی رازونهێنی ئەو خەسلّەتە هیچ و پووچەی، ماوەیەك لە دیار سەریان وەستا و یەك دووجـار کـۆخی و بە شەرمەوە:

- کە منداڵبووم، نازانم بۆچی؟... دایکی رەحمەتیم لە پڕێکدا بەرامبەر پیـسی و چەپەلّی، تووشی دوودلّی و راڕایی هات، لە جیاتی جارێك و دووجار، رۆژ نەبوو دە جـار زیاتر ناو مالّی پاك نەکردایەوە و منیشی لە گەلّ خۆی نەشوشتبوایە، نەك هەر ئەونـدە،

بگرە باوکی هەژاریشم، کە وەك کریکاریك لە بەیانی تا ئێوارە کاری دەکرد، ئەویشی ناچار کرد ڕۆژێ سێ چوار جار خۆی بشوات، ئەخۆشیەکە درێژەی خایاند، باوکم بەرگەی نەگرت، ژنێکی تری خواست و وازی لێمان هێنا، وامزانی لە ژێر کاریگەری خەم و خەفەتی سەربەهەوێ بووندا، دایکم واز لەو بەدکارییەی دەهێنێت، کەچی بە پێچەوانەوە، ئەوەندەی تری زیاد کرد، تا رادەیەك رقم لە ناو بۆوە، ئەگەر زیاد تێنووم نەبوایە، مەحالّ بوو دەمی خۆمی بگەینمی، وام لێهات کە چاوم بە ناو دەکەوت، مووچڕکی ترس بنی پێمی دەگرت و لە تەوقەی سەرمدا دەردەچوو، بە هەر حالّ، خەریك بووم ئەقلّم بە یەکجاری لە دەستبدەم، بەلاّم لە پڕێکدا دایکم وەك بلّێین قەناعەتی بە ئاویش نەما، بۆ پاککردنەوەی جەستەی، دوا جار خۆی بۆ هەتا هەتا بە ئاگر شوشتەوە، منیش هەر چەندە لە شەرمی کەس و کار و دراوسێکانمان، هەندێك هاتوهاوارم کرد، بەلاّم لە دلّیشەوە جەژنەپیرۆزەم لە خۆم کرد.

ئەوەی گوت و تەماشای کاتژمێری دیوارەکەی کرد و بەرەو گەرماوەکە رۆیشت، پێش ئەوەی هەمان گەمە تەواو بێت، مەلا بە پەلە پەل سەری خۆی شوشت و دەستنوێژەکەی گرتەوە، گەڕایەوە هەمان ژوور، بەرمالّەکەی بۆ نوێژی شێوان راخست، بەلاّم پێش ئەوەی دەست بە نوێژەکەی بکات، جارێکی تر تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کردەوە و رووی کردە مام مەجید و:

- ئەو خۆیرییە زۆر دواکەوت.

مام مەجیدیش، کە توشی هەمان چارەنووسی مەلا هات و گێمەکەی دۆڕاند، سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد وپشتی خۆی دایەوە دیوارەکە و:

- وازبێنە، با سەریان بە تەواوی گەرم بێت !!

حاجی هەمزە، کە ئەو کاتە لە ئاودەستی ناو حەوشەکە دەستنوێژەکەی گرتبۆوە، گەڕایەوە ژوور و هێشتا شوێنەواری لەزەتی سەرکەوتن بە رووخسارییەوە دیاربوو، تا مەلا لە نوێژەکەی بووە و بەرمالەکەی جێهێشت، بە پێوە وەستا، ئینجا شوێنجێی

گرتەوە و دەستەکانی بەرزکردنەوە، بەڵام لە پڕێکدا پێش ئەوەی نییەت بێنێت، بە دوودڵی ئاوڕێکی لە مەلا دایەوە و:

- باشە مەلا حەرام نییە ئێمە بچینە شوێنی خواردنەوە؟!

مەلا بە چاوێکی زەقەوە سەیرێکی مام مەجیدی کرد و بە نیمچە تورەیی:

- ئینجا بێ قەزابی، خۆ ئێمە ناچین قوزەڵقورتی بکەین؟!

لە گەڵ ئەو وەڵامدانەوەیە، زەنگی دەرگاکە لێدرا، مەلا سالّح و مام مەجید خێرا خۆیان پێچایەوە و شت و مەکە وردەواڵەکانیان هەڵگرت و دەرچوون، هەر کە سواری جێبەکە بوون، سمۆ بە رووخسارێکی شەرمین، ئاوڕێکی لە مام مەجید دایەوە و لە سەر خۆ بە دودڵی:

- من نالێم خوێنەکە فەرامۆش کەین... بەڵام وا باشە هەموومان ملکەچی ئارەزووە سەختەکانی تۆڵەسەندەوە نەبین، ئەنجامی پەلەکردن زۆرجار ریسوایی وپەشێمانییە، من دەڵێم، باشتر نەوە، بدرێتە یاسا ودادگا.

- گەمژە یاسا تەنها لە سەر کەسانی وەك تۆ جێبەجێ دەکرێت !!.

- ئاخر کێ دەڵێت، دەستی لەو تاوانە هەیە؟!

هەر کە مام مەجید لە وەڵامدانەوە بەدواکەوت، مەلا سالّح لە سەرخۆ گوتی:

- ئەگەر لەو تاوانەش دەستی نەبێت، سەد ئەوەندەی بەشی ئەم سەربڕینەی، تاوانی هەیە !!

لەوانەیە هەموویان ئەو رۆژە لە بنەرەتدا بۆ پشتیوانی جوتیار و تۆڵەسەندنەوەی کۆببوونەتەوە، هەموویان بەدروستی هاورێ و دۆستی پاکی ئەو بن، بەڵام لە راستیدا ئاشکراش بوو کە هەریەکێکیان بەش بە حاڵی خۆی لە ناخەوە حەزی لە چارەی ئەو قەشمەرە نەدەکرد، ئەو بێنابڕووە زیاتر لە هەر خۆلامێکی تری ئاغا هەمیشە تەنگی بە مەلا هەڵدەچنی و گاڵتەی پێدەهات.

حاجی هەمزەش، کە نوویژەکەی لە چوار روکعەت نەدەچوو، بە پەلە پەل سلاوی دایەوە، دەمانچەی جوانەمەرگەکەی خستەبەر پشتێنەکەی و دوایانکەوت... ئەو دەمانچەیە، کاتی خۆی بۆ کورە تاقانەکەی کریبوو، تاکوو لە کاتی تەنگانە خۆی پێ بپارێزێت، کاتێك تەرمەکەشیان دۆزییەوە، دەمانچەکە چەند هەنگاوێك لە تەنیشتێکی کەوتبوو و سێ گوللەیشی لێ دەرچوو بوو، ئەویش هەڵیگرتەوە و سوێندی خوارد، کە داینەنێتەوە، تاکو بەرماوەی گوللەکانی لە کەللەی سەری بکوژەکەی نەچەقێنێت، لە هەمان شوێنی رووداوەکە، کۆمە بەردێکی دروست کرد، رۆژ نەبوو جارێك سەردانی نەکات، خۆ ئەو هەر لە بەر خاتری ئەو کورە لاوە، ژنی دووەمی هێنا، پاش ئەوەی سالانێکی زۆر چاوەروانیی کرد و ژنی یەکەمی تەنها کچی دەبوو، هەر لە بەر خاتری یادی ئەو کورەیشی، کە زۆر تامەزرۆی خوێندن بوو، رووبەرووی ویستی ئاغا بۆوە و رەزامەندی کردنەوەی قوتابخانەکەی بە دەستهێنا، ئەو حەوشەی کە سەد و یەك هەزار شوێن پەنجەی یادگارییەکانی تێیدا بەجێهێشتبوو، بەخشییە مامۆستاکە، هەموو خوارزا و برازاکانیشی لە بەر خاتری ئەو، بە خۆرایی خۆیان بۆ تازەکردنەوەی بینایەی خوێندنگاکە بەخشی، ئێستاش پاش چەندین ساڵ چاوڕوانی، لە سەر قسەی جوتیار، لە گەڵ مەلا سالح و مام مەجید وەك دوو شایەتحاڵ روو دەکەنە شار، بەڵکو لە سەر زاری عەولای، شتێك لە مەڕ هۆکاری رووداوەکە بزانن... پیلانەکە ئەوەبوو، کە ئەو هەر لە دەرەوە،لە پاش پەنجەرەکە، گوێ بۆ دانپیانانەکانی عەولای سەرخۆش شلکاتەوە، ئەگەر دانی بە تاوانەکەی دا، ئەو یەکسەر دادەبەزێتە دیار سەری ولغاوی نیشانەگرتنیش دەخاتە دەست ناخە داخدارەکەی.

هەر کە گەیشتن، بە پێی پیلانەکە بلاوبوونەوە، سمۆ ژەمی دووەمی خواردنەوەکەی لە جێبەکە دەرهێنا و بۆ جاری دووەم سفرەی بەردەمیانی رازاندەوە، عەولاش بە پەرۆشییەوە پەلاماری بتلێکی دا و خێرا سەری هەڵگرت و پێکێکی دروست کرد:

- دەست خۆش سمۆ، بە خوای پیاوی و زۆر دوانەکەوتی.

لە گەڵ ئەو قسەیە، تەقەی دەرگاکە هات، سمۆ بە رواڵەتی مۆڵەت وەرگرتن سەیرێکی هەژاری کرد، ئەویش بە نیمچە سەرخۆشی سەری بۆ لەقاند، هەر کە سمۆ گەڕایەوە، مام مەجید و مەلا ساڵح وەژوور کەوتن و بە گەرمی سڵاویان کرد، کە چاویان بە عەولاّ کەوت، ماوەیەك بە روویەکی سەرسامییەوە لە دیار سەریان وەستان، بەڵام عەولاّ بە کەمترخەمی قوومێکی تری لە پەرداخەکەی دا و:

- دەوەرن بەخوای هەر ئێوەمان لێ کەم بوو، مەلا ساڵح تۆ وەرە تەنیشت من بەڵکو کەمێك خێر و بەرەکەتی تۆمان بە سەردا ببارێت.

ئەمەی گوت و داوای لە سمۆ کرد تاکو دوو پەرداخی تریان بۆ بێنێت، بەڵام سمۆ سێ پەرداخی هێنا و ئەویش بە ترسەوە لە تەنیشتیان دانیشت... جوتیار و هەژار کە تازە بە هەردووکیان بتڵێکیان تەواو کردبوو، سەریان گەرم ببوو، جارێکی تر پێکەوە پەرداخەکانیان لێکدایەوە و بەرەو ناو کەش و هەوایەکی فەلسەفیدا پاڵیان بە خۆوە نا، بە زمانە قورسەکانیان، وەك زەرادەشت لە مەڕ هۆکارەکانی شەڕدا کەوتنە دانوساندن، سەرئەنجام هەژار کە لێوی خوارەوەی بە لایەکدا شۆڕببۆوە، قومێکی تری لە پێکەکەی دا و بە تووڕەیی:

- زەرادەشتیش درۆی دەکرد، لە سەرەتای پەیامەکەی، بانگهێشتی ئەوەی دەکرد کە رەگی شەڕی ئاشکراکردووە و دەبێت بە رووناکی تاریکی لە ناو ببرێت، کەچی هەر کە بووە خاوەن دەسەڵات، دەستی بۆ مشتوی شیرەکەی برد.

جوتیار لە ژێر گرانی پێلووکانی، نەیتوانی وەڵامداتەوە، عەولاّ بە رواڵەتی گاڵتە بازی، سەیرێکی مەلا ساڵحی کرد و:

- مەلا تۆش شتێکمان دەربارەی هۆکارەکانی خێر و شەڕ بۆ بڵێ.

مەلا بە وریایی ئاوڕێکی لە پەنجەرەکە دایەوە وخێرا فڕێکی لە پێکەکەی داو:

- هەمان ئەفسانەکەیە... شەیتان فریشتەیەکی مارە کرد و مرۆڤیان لێ پەیدا بوو، ئینجا مرۆڤ سفەتی هەردووکیانی وەرگرتووە، هەندێکیان زیاتر لە شەیتان دەچن و هەیەش زیاتر لە فریشتە؟.

- تۆ بڵێی مەلا من زیاتر خەسڵەتی کامیانم هەڵگرتووە؟
- حەیفت نەکرد، تۆ دەقاودەق کوڕی باوکتی !!!
- خوا بتگرێت مەلا ساڵح.....

بێ پچڕاندنی قسەکانی، پێکەنینێکی شـێتانەی بـەردا وئینجـا بـە یـەك قـوم بنـی پێکەکەی هێنا و بەشێوەی گاڵتەجاری رووی کردەوە دانیشتووان و:

- ئینجا هەر خۆتان ناوبژیوان بن، باشە کەسێك، قادر بـەگ ئاغـای بێـت و ئـەم شەکرەش مەلای بێت، تۆ بڵێی چ مرۆڤێکی لێ دەردەچێت.

مەلا ساڵح لە گەڵ خواردنەوەی پێکێکی تر، بە تووڕەیی:

- کوڕم خۆ من نەمگوتووە کوشتن و ئەتك بردن بکە؟
- ئەی ئێوە ناڵێن سەد گوناه و یەك تۆبە؟!
- نا بەڵام بەو مەرجەی کە یەکـەمجار دان بـە گوناهەکانتـدا بنێیـت و بەتـەواوی پەشیمانی خۆت راگەینیت.
- تاوانێك نەبێت، ئەگینا من بۆ هیچێکیان ژیوان نیم !!
- کوشتنی میرزای کوڕی حاجی هەمزە، وانییە؟!

لە گەڵ درکاندنی ئەو ناوە، عەولا پێکەنینێکی تری شێتانەی بەردا و پێکێکی تـری دروست کرد، جگارەیەکی تری داگیرساندن و:

- ئەو لە ئاگری گوناهەکەیدا سووتا.

ئەمەی گوت و سەیرێکی هەژار و جوتیاری کرد، هەردووکیان شان بە شـانی یـەکـدی پشتیان دابۆوە دیوارەکە و خەویان لێ کەوتبوو، ماوەیەك بە بـەزەیی لـە دەم و چـاویان وردبۆوە، لە شوێن خۆی هەستا و بە نەرمی هەر یەکە و بۆ لایەکی وەرگێڕا و سەریانی خستە سـەر سـەرین، لـە ژووری تەنیـشتیان دوو بـەتانی هێنـا و بـە جـوانی دای بـە سەریاندا، گەڕایەوە شوێنی خۆی و:

- ئەم ساختەچیانە بەرگەی خواردنەوە ناگرن، لە گەڵ دوو قووم لە خۆ دەچن.

ئەوەی گوت و ئاوڕی لە مام مەجید دایەوە و جگارەیەکی پێشکەشکرد و:

- خۆزگە منیش باوکێکی وەك تۆم هەبوایە !!
- ئەریّ وەللا، هەتیوخانەم داناوە و هەرتۆمان کەم بوو !!

مام مەجید لە گەلّ وەلاّمدانەوەکەی سەیرێکی هەژاری کرد وبەزەیەکی نەرمی بەردا، نەوەك لە گەلّ ئەو وەلاّمدانەوەیەش عەولاّ قسەکانی لە بیرکاتەوە، مەلا سالّح خێرا قوومێکی تری فرکرد و:

- ئینجا ئەو گەورە گوناهەی میرزا چی بوو، تا بەو چارەنووسەی بگەیێنێت؟
- کوشتنی سەگێکی بەستەزمان.

هەر کە ئەو قسەیەی کرد، مەلا و مام مەجید بە روالّەتی بێبڕوایی، پێکەوە بە سەرسامی، دەمیان دابچڕا وچاویان بڕیە دەمی، ئەویش ناچار بوو بۆ تێگەیاندنیان، سەر لە نویّ، بە سەرهاتی خۆی و دایکی و رەشۆی سەگی لە سەرەتاوە باسکاتەوە... ئینجا باسی لەوە کردەوە، کە میرزا نزیکترین هاوەلاّنی عەلاوەدین بوو، کە دوژمنایەتیی لە گەلّدا هەبوو... گوایە میرزا هەر لە سەرەتاوە، پشتگیریی لەو هاوەلّەی دەکرد و پێکەوە دژایەتی ئەویان دەکرد، بە دانپییانانی خودی ئەو عەلاوەدینە، بۆ تۆلّەسەندنەوەی شەقازللەکەی مندالّییان، ئەوان پێکەوە رەشۆیان ژەهرخواردکرد، پاشانیش هەر کە فێری کاری بەدڕەوشتی بوو، جارێکیان پێکەوە لە سەر بەرزایی شاخێکە، بەرگەی نارەزووە شەرمینەکەی نەگرت و داوای ئەو بەدکارییەی لێکردبوو، میرزاش هەر کە زانیی هاوەلّەکەی توشی چ بەدڕەوشتییەك هاتووە، هەولّی دابوو لە خۆی دوورخاتەوە، وەك هەڕشەیەك دەمانچەکەی دەرهێنا و هەندێك تەقەی بە ئاسمانەوە هەلّدابوو، ئەویش نەوەك رازونیازی بۆ خەلّکەکە ئاشکرابێت، دەرفەتێکی بە هەل زانی و لە پڕێکاپەلاماری دا و لە سەر لێواری بەرزایی شاخەکە، بە توندی پالّی پێوەنا......

پاش نیوەڕۆ، جوتیار بە تەمەڵی پێلوی چاوەکانی کردنەوە، ماوەیەك بنمیچی ژوورەکەی نۆڕی و دایخستنەوە، ئینجا لە پڕێکدا لە شوێن خۆی راپەڕی، سەیری هەر چوارگۆشەی ژوورەکەی کرد، تەنها هەژار لە گەڵ پڕخێنێکی نەرم پاڵکەوتبوو، بە شپرزەیی پەلاماری دا و بە ئاگای هێنایەوە:

- ئەی ئەوانی تر؟!

هەژار هەر لە سەر پێخەفەکەی بەدەم خەوەوە:

- سەگیان تێبەردە.

ئەمەی گوت و جارێکی تر بە دەم باویشکدان سەری نایەوە سەر سەرینەکە، خەریك بوو دەست بە پڕخە پڕخە نەرمەکانی بکاتەوە، بەڵام جوتیار بە تورەیی پەلاماری دایەوە، دوو سێ جار رایتەکاند و بە تەواوی بە ئاگای هێنایەوە و:

- هەتیوو سەگی چی و تێبەردەی چی؟... کوانێ عەولا و ئەوانی تر؟

لە گەڵ درکاندنی ناوی عەولا، هەژاریش بە واقوڕمانەوە لە شوێن خۆی راپەڕی، بە ترسەوە لە سەرانسەر فەرش و لاکێشەکانی ژوورەکە وردبۆوە و:

- زۆر باشە،هیچ شوێنەواری خوێنیان پێوە دیار نییە !!

بە واقوڕمانەوە ماوەیەك تێکڕامان، لە پڕێکدا هەردووکیان پێکەوە بەرەو ناو حەوشەکە بازیاندا، لە سەرەوەی دیوارەکە تەماشایەکی بەردەرگا و کۆڵانەکەیان کرد، هەر کە جێبەکە لە شوێن خۆی نەمابوو، بە پەلەپەل گەڕانەوە، بە وردی هەموو ژوورەکانیان پشکنی، هیچ شوێنەوارێکی کوشتنیان بەرچاو نەکەوت، جوتیار لە سەرخۆ:

- وادیارە، مام مەجید قایل نەبووە لێرە بیکوژن و بۆ شوێنێکی تریان گواستووتەوە.

- تۆ بڵێی چۆنیان کوشتبێت.

پاش خۆشکردنی گەرماوێك، بۆ خواردنی نیوەرۆژ بەرەو بازار چوون. بێ ئەوەی کەسێکیان پێشنیار بکات، هەردووکیان پێکەوە روویان کردە هەمان ئەو چێشتخانەیەی پێش چەند رۆژێك لە گەڵ عەولا نانیان لێ خوارد، لە سەر هەمان مێزی جارانیان دانیشتنەوە، بە بەزەیی سەیری شوێنجێی عەولایان کرد و یادی ئەو دانیشتنەیان کردەوە... ئەوان هەرسێکیان بە ئەستەم توانییان هەر یەکە و نەفەرێك بخوات، کەچی عەولا دوو نەفەری قووتدا و هێشتاش بەتەواوی قەناعەتی نەهاتبوو... لەو یادکردنەوەیە دابوون، کاتێك خزمەتکاری چێشتخانەکە بۆ زانینی داخوازیەکانیان لە دیار سەریان وەستا، هەردووکیان بە بێتاقەتی ماوەیەکی کەم لە رووخساری یەکدی وردبوونەوە، ئینجا جوتیار بە داماوی جگارەیەکی دەرهێنا و:

- من برسیم نییە، تەنها چایەکم بۆ بێنە.

هەر کە خزمەتکارەکە رووی کردە هەژار، ئەویش بەزەردەخەنەوە:

- لە راستیدا منیش برسیم نییە، بۆ منیش هەر چایە و جامێك ماستاو بێنە.

ئەمەی گوت وپەلاماری جگارەکەی دەستی جوتیاری دا و لێی رفاند و:

- پارەم پێنییە، بنێرە پاکەتێکم بۆ بێنن.

- ئەی پارەی فرۆشتنی دوکانەکەت چیی لێهات؟!

- فرۆشتنی چی؟......

ماوەیەك بیری رۆیی، پاشان پەلاماری گیرفانی ناوەوەی چاکەتەکەی دا، کۆمە پارەکەی دەرهێنا و بە پێکەنینەوە دەستی بە ژماردنیان کرد و:

- ئاگات لێبوو چەند رەوانبێژ و قسەزانبوو!! چۆن بە لێهاتووی ئەو هەموو بەسەرهاتانەی دەگێرایەوە ؟ ئەگەر کەسێك نەیناسیبوایە دەیگوت چ رۆماننووسێکە؟!

- ئەو پەروەردەی کۆچك و دیوەخانەکان بوو،

هەژار لە گەڵ خواردنەوەی ماستاو و چایەکە، ماوەیەك کەوتە بیرکردنەوە،پاشان بەرووخسارێکی شەرمنەوە:

- خۆ لە رۆمانەکەتدا ئاماژە بەم برە پارەیە ناکەیت؟!

جوتیار زەردەخەنەیەکی کرد و:

- هەستە با سمۆ گرنکترین بەشەکانی ئەو رۆمانەمان بۆ باسکاتەوە، پاشان بیرێك لەم مەسەلەیەش دەکەینەوە.

هەر کە هەستان، هەژار بۆ یەکەمجار لە ژیانی، بە گەرمی پێشیکەوت، دەستی بۆ گیرفانی بردەوە، تاکو پارەی چایە و ماستاوەکە بدات، بەلاّم لە پرێکدا مەسەلەی ژنهێنان و پێشبینیەکەی پیرە سارای هاتەوە بیر، ئەو برە پارەیە کە لە ئاسمانەوە بۆی دەنێردرێت دەبێت تەنها بەو بۆنەیەوە خەرج بکرێت ئەگینا کاریگەرێتیە تەلیسماویەکەی لە دەست دەدات، هەر چەندە ئەو جاران بڕوای بەو قسانە نەبوو، بەلاّم خۆ قسەکانی هەمووی ئەوەتا هاودەق دەرچوون و بە دووریش نازانێت هەر بەو زووانە وەك پیرە سارای فالچی فەرمووی زرپاوکی دەست لە ملی دەئالێنێت و ماچ بارانی دەکات و داوای لێبوردنی لێ دەکات، دەستی کێشایەوە، بە شەرمەوە سەیرێکی جوتیاری کرد، ناچاربوو خۆی دایەوە پاش، جوتیاریش بە زەردەخەنەیەکی تر پێشی کەوتەوە و پارەکەی داو دەرکەوتن.هەر بەرێوە، بە خەیاڵ، هەر یەك بە رەنگێك وێنای کوشتنەکەی دەکرد و گریمانەکانیان هەڵدەسەنگاند، جوتیار قسەکەی مەلای هاتەوەبیر کە هەر ئەو شەو بە چرپە چرپ یەکتریان دەدواند:

- مەلا گیان، ئەو هەردوو گیانە تا ئێستاش ماڵ ئاواییان لەمدونیایە نەکردووە، هەمیشە گوێم لە دەنگیانە.

- دڵنیابە ئەو هەردوو گیانە پیرۆزە پاش ماوەیەکی تر لە بەهەشتی پان و بەریندا سەیران دەکەن.

هەژار هەر سوور بوو، کە شێوەی کوشتنەکەی یان بە دەمانچەکە بووە، یان لە بەرزایی شاخێکدا فرێدراوە، بەتەنیشت دارتاشەکە بە ناوڕدانەوەیەکی خەمۆکی تێپەڕین، لە گەڵ بانگی ئێوارە گەیشتنە چایخانە، سمۆ بە بێتاقەتی خەریکی شووشتنی پیاڵەکانی

بوو، وازی له کارەکەی بەردەستی هێنا و سێ پیاڵە چایەی تێکرد و خۆیشی له تەنیشتیان دانیشت و:

- سەرم خەریکە بتەقێت.

هەژار له گەڵ تێکدانی چایەکەی، بۆ زیاتر متمانە، دەستی خستەوە سەر گیرفانەکەی و هەر کە دڵنیابووە لە پارەکەی، لە ناخەوە نۆخەیەکی ناسوودەیی بەردا و لە سەرخۆ چرپاندی و:

- دیارە زۆر هیلاکی و بە درێژایی شەو نەخەوتوون؟!

- ئێوە زوو بە زوو مەست بوون و خەوتان لێکەوت، مام مەجید و مەلاش پاش بیستنی بەسەرهاتەکانی عەولا دەرکەوتن و لە گەڵ حاجی هەمزە بە جێبەکە رۆیشتن.

- ئەی حاجی.......

- لە گەڵ گێڕانەوەی بە سەرهاتەکە، نەك هەر مەلا و مام مەجیدی سەرخۆش، کە چاوەکانیان فرمێسکیان تیا قەتیس مابوو، بگرە من کە لە نزیك پەنجەرەکە دانیشتبووم، دەنگی حاجیم لە دەرەوە دەبیست، ئەو زیاتر لە هەریەك، لە گەڵ بیستنی ئەو بەسەرهاتە دڵتەزێنانە، لە پرمەی گریانی دەدا و بەردەوام نوسکە نوسکی دەهات.

- ئەی عەولا چیی لێهات؟!

- ها؟! عەولا؟!! نا نا، هەر کە من و ئەو خۆ بە خۆ ماینەوە، عەولا بەرماوەی نارەقەکەی سەرەوخوونی ناو پەرداخەکەی کرد و بە یەك قووم خواردیەوەی و بە روو خۆشی سەیری کردم و گوتی: دەزانی کاك سمۆ؟! من ئەو پیرە سارایەم زۆر خۆش دەوێت!! ئەو تاقە کەسێکە کە پرسیاری ناوی باوك ناکات، دەیگوت لە ئاسمانیش هەر رەگەزی دایك پەسەندترە و.... ئیتر لە گەڵ ئەو ناخاوتنەی دا، بتڵێکی بۆشی هەڵگرت و بەو پەڕی پەرۆشیەوە دەرچوو، لە ترسی ناشووبەنانەوەی، ئەو شەو هەمووی خەو نەچوو چاوم، بەرە بەیانێکی زوو گەڕایەوە و.......

یان کاریگەری خواردنەوەکە، هێشتان سەری سمۆی بەرنەدابوو، یان لە ژێر ژانی سەری نیمچە بێئاگابوو، هەر کە لە گێڕانەوەکەی گەیشتە ئێرە، لە شوێن خۆی گەشکەیی بوو، وڕەی نەهات، زەندەقی چوو، ڕەنگی بەرەو زەردی هەڵگەڕا، هەناسەکانی پچڕان، سەری بەرەو خوارەوە چەمایەوە و لە هۆش خۆی چوو، خەریك بوو سەروسەر وەرگەڕێتە ژێرپێ، بەڵام هەژار پەلاماری دا و کێڵێکردەوە، دەستی لە سەر سینگی دانا و بەرووخسارێکی تۆقێنراو، رووی کردە جوتیار و:

- دڵی وەستا !!

بە گوڕ هەردووکیان لە جێگەیان ڕاپەڕین، بە تاودان تاکسییەکیان ڕاگرت وگەیاندیانە خەستەخانە، دەستبەجێ لە سەر تەختێکدا درێژیان کرد، پزیشکی نێشکگر پاش پشکنین، سۆندەی پاڵاوتنی بۆ بەستەوە و بە سرنجیش چەند دەرمانێکی خستە ناو ئاوەکە و داوای حەسانەوەی بۆ کرد، جوتیار و هەژار بە رووخسارێکی تۆقێنراو لە بەر دەرگاکە دانیشتن، بە دڵەڕاوەکێ چاوڕوانی بڕیاری رۆژگاریان دەکرد، لە پڕێکدا لە گەڵ قیژە و هاوار هاوارێکی دڵ تۆقێنەر، لە سەر پێیانیان چەقینەوە، چەند کارمەندێکی خەستەخانەکە لە ناو ڕێڕەوەکە بە شپرزەیی پاڵیان بە تەختی پیرێژنێکا دەنا، هەر کە بەرامبەریان تێپەڕین، لە گەڵ پیرە سارای چاو کلرێژکراو چاوەکانیان تێکبڕان، ئەو بەناڵە ناڵەوە پێڵووکانی داخست و بە ڕاکشاوی رووی خۆی گۆڕی، ئەوانیش سەرەتا ویستیان بە هاواریەوەی بچن بەڵام لە حەژمەتی قیژینی سمۆ سارایان لە بیر کرد و بە تەنگاوی لە میانی پەنجەرەکە ناوڕیان لێی دایەوە، دەتگوت جادووی لێکراوە، جار پێدەکەنی وجار جاریش لە قیژەی گریانی دەدا، ئەوان سمۆیان وەك برایەکی بچکۆڵانەی خۆیان دەژمارد، مردنی سمۆ کارەساتێکی گەورەیە و بۆشاییەکی ترسناك لە ژیانیان پەیدا دەکات و ئەستەمە قەرەبووی بکرێتەوە، ماوە ماوە بە بەزەیی هەر لە پاش پەنجەرەکەوە ناوڕێکیان لێی دەدایەوە و بە گوڕ فرمێسکیان بۆ دەڕشت، ماوە ماوەش بە دڵتەنگی و بێئارامی روویان دەکردە ژووری پزیشکەکە و لێیدەپاڕانەوە، ئەویش بە قسەیەکی خۆش

دڵیانی دەدایەوە. خۆ تاو تاویش ئاوڕیان لە دەرگای ئەو ژوورە دەدایەوە کە تەختی پیرە سارایان بۆ گواستبووە، نەبادا هەژار بە یەکجاری ئۆقرەی لێ برابوو و هەر کە برینپێچێکی گەنج لە ژوورەکە بە خێرایی دەرکەوت، ئەو بە تەنگاوی بەرەو پیری چوو و پرسیاری باری ئەو ناخۆشە بەستەزمانەی لێکرد، ئەویش هەر بە ڕێوە، بە قێز و بێز ماوەیەك لە دەست و بازووی ووردبووە ئینجا بە گرژ و مۆنی:

- ئەو قاحپایە دیارە کەسێکی وەچەنگ نەکەوتووە و بتڵی ئارەقی بەکارهێناوە و ناو سکی خۆی دڕاندووە!!

پاش ئێوارەیەکی درەنگ، سمۆ هێدی هێدی بە هۆش خۆی دەهاتەوە، جوتیار و هەژار، کە ئەو کاتە لە دیار سەری، بە خەمۆکی وەستابوون، لە پڕێکدا روویان گەشبۆوە و ویستیان لە خۆشییا هاواربکەن، بەڵام سمۆ لە ناکاو قیژاندی و دەستی بە گریانێکی سەخت کرد و جارێکی تر بوورایەوە، ئەوانیش لە سەر پێشنیاری پزیشکەکە، بە دوودڵی ژوورەکەیان جێهێشتەوە، لە ناو باخچەی خەستەخانەکە، هەر لە سەر چیمەنەکەدا چوارمشقی دانیشتن و جگارەکانیان داگیرساندەوە، هەژار کە بە هۆی پیرە سارا و مەسەلەی بتڵەکەی، بارەکە زیاتر کاری تێکردبوو، بە سۆزەوە:

- خوانەکات بمرێت، بەڵام ئەگەر مردیش لە تەنیشت گۆڕی باوکم دەینێژین.
- کێ؟ سارا؟!
- هەتیوو سارای چی؟ من مەبەستم سمۆیە.

وادیار بوو بوورانەوەکەی دووەمی سمۆ زۆری نەخایاند، کارگوزارێکی خەستەخانە هەر لەبەر دەروازەی بینایەکە بە رووخۆشی بانگی کردن، خێرا گەڕانەوە دیار سەری، سمۆ خەریکی خواردنەوەی پەرداخێك شیر بوو، هەر کە چاوی پێیان کەوت، پەرداخەکەی دانا و:

- با دەرچین.
- ئاخر بێ پرسی پزیشك ناکرێت دەرچیت.

بێ وەڵامدانەوە، سمۆ لە سەرخۆ هەستایەوە سەرپێی و ژوورەکەی جێهێشت، ئەوانیش ناچار بە بێدەنگی دوایکەوتن، هەر کە گەیشتنە سەر شەقامەکە، جوتیار ویستی تاکسیەك راگرێت، بەڵام سمۆ پیاسەکەی پێخۆشتر بوو، هەرسێکیان شان بە شان بەرەو ماڵەوە کەوتنە رێ، پاش ماوەیەك بێدەنگی، هەژار بەرگەی نەگرت و:

- باشە بۆ پێمان ناڵێیت بۆ وات لێهات؟!

- عەولام کوشت !!!

ئەمەی گوت و پشتی دایەوە بنە چنارێکی کەنار شەقامەکە و لە پرمەی گریانی دایەوە، هاوەڵەکانیشی بە واقی ورمانەوە بەرامبەری وەستان و هەردووکیان پێکەوە:

- چیی؟!!!

- بڕواتان هەبێت، من نەمدەویست بیکوژم، ئەو ناچاری کردم !

هەوایەکی سارد هەرسێکی لەرزاند، وەك برایەکی گەورە دایانە پێشخۆیان، لایانداپە چێشتخانەیەکی سەر رێگایان، لە گۆشەی سەرەوە دانیشتن وخواردنەکەیان داواکرد، ئینجا هەژار دەستی لە سەر ملی دانا و:

- ئێ کاك سمۆ، ئێستا هەر لە سەرەتاوە، مەسەلەکەمان بۆ باسکەوە.

سمۆ پشتی بە پەنجەرەکەوە بوو، بارانێکی ناکاو بە توندی جامەکانی ناوپرژێن کرد، خۆنەویستە لە شوێن خۆی راتەکا، بەشەرمەوە هەردوو ئانشکی لە سەر مێزەکە دانا و دەم و چاوە پەشۆکاوەکەی خستە ناو دەستەکانی، ماوەیەك بێدەنگ بوو، ئینجا سەیرێکی ئەم لاو ئەو لای مێزەکەیانی کرد، هەر کە دڵنیابوو کەس لە نزیکیانەوە دانەنیشتووە، بە ساردییەوە:

- دوێنێ شەو درەنگان، کە گەڕایەوە، نازانم کامتان مەسەلەی منتان بۆ باسکردبوو، جگارەیەکی داگیرساند و دەمانچەکەی دەرهێنا وگوتی: ها سمۆ گیان بگرە و کەس مەکوژە... ئینجا لە گەڵ بەردانی پێکەنینێی شێتانەی، کەوتە سەرگازی پشت، پاشان هەستایەوە وپێی گوتم: سمۆ گیان گاڵتەم کرد... لە پڕێکا خەم و خەفەتێکی زۆر

رووخساری داگرت و گوتی: سمۆ سەد خۆزگەم بە تۆ... ئینجا درێژەی بە قسەکان داو... مەلاکان دەڵێن: دۆزەخ لە پاش مردن دێت، بەڵام من دڵنیام، کە ئەو دۆزەخە ئا لێرەیە، ئاخ کە پێویستم بەو دۆزەخەیە کە مەلاکان باسی لێ دەکەن... بە رواڵەتێکی پاڕانەوە رووی تێکردم و گوتی: دوێنێ شۆڕبوومەوە ناو ژێرزەمینەکە و خاچێکی خنجیلانەم دیت، بە پەرۆشەوە، لە ئامێزم گرت و ماچبارانم کرد، زۆر هەوڵمدا خۆمی پێوە هەڵواسم، بەڵام نەمتوانی... ماوەیەك لە گەڵ جگارە کێشانەکەی بێدەنگ بوو، ئینجا بە تکا و پاڕانەوە داوای لێکردم، کە لە هەڵواسینیا یارمەتیی بدەم، سەرم گەرم ببوو، بێ دوودڵی لە گەڵی چووم، ئەو زۆر بەدڵچوونەوە کارەکانی بۆم ئاسان کرد، منیش پووختە لە خاچەکەم بەستەوە، هەرکە گوریسەکەش تەواوبوو، باش بە بیرم نایەت، بەڵام وابزانم ئەویش هەر لە سەر داوای ئەوبوو، بزمار و سنگەکانم هێنا و بزمار ڕێژمکرد و پاشان سنگەکەشم لە نێوان هەردوو چاوانیدا چەقاند.

- ئەی چۆن بوو ئێمە لە سەر قیژە و هاوارەکانی بە ئاگا نەهاتین؟!
- ها، قیژە و هاواری چی؟!... ئەو هەر پێدەکەنی !!

ئەوەندە بە وردی گوێیان بۆ شلکردبۆوە، ئیتر پەیبان بە خواردنەکە نەبردبوو، کە ماوەیەکی زۆر بوو لە بەر دەمیان دانرابوو، بە نادڵی هەر یەکە و دووسێ کەوچکی لە خواردنە ساردەکە دا، پاشان جوتیار بۆ دڵدانەوەی سمۆ:

- دەست خۆش، ئەوەی تۆ کردت، کەس نەیتوانیوە بییکات، تۆ ئەم کۆمەڵگایەت لە دڕندەترین دەعبا رزگارکرد، وانییە هەژار؟!
- ها، ئا بەڵام با بیرێکیش لە شاردنەوەی لاشەی بکەین.

باران تەواو بوو، هەرسێکیان بە پیاسە بەرەو ماڵەوە کەوتنەوە رێ، یەکـەمجار بیریـان لەوە کردەوە بچنە ماڵی جوتیار و بە هەر بەهانەیـەك بێـت جێبەکـە لـە مـام مەجیـد وەرگرن و پاشان بچن تەرمەکە هەڵگرن و بۆ دەرەوەی شار بییگوازنەوە، بـەڵام جوتیـار وای پێباش بوو کە ئەو بـچێت جێبەکـە بێنێـت و ئـەوانیش لـەو ماوەیـەدا هەوڵبـدەن تەرمەکەی لە ژێرزەمینەکە دەربێنن و لە ناو رایـەخێك بیپێـچنەوە، هـەر کـە جێبەکـە گەیشتە بەردەرگاکەش، با ئەوان هەر لە سەر دیوارەکە، لاشەکەی بە خێرایی ئـاودیوی پشتەوەی بکەن، کەچی هەژار بەو پێشنیارە زۆر نارەحت بوو و سووربوو لە سـەر ئـەوەی هەرسێکیان پێکەوە تەرمەکە دەربێنن، هەر چۆنێك بێت، رێککەوتن کە جوتیار و هەژار بە کارەکە هەستن و سمۆش جێبەکە بێنێت، پێش ئەوەی بگەنە ماڵی هەژار، هەر لە سەر شەقامە سەرەکییەکە، سمۆ تاکسیەکی راگرت و ئەوانی بە جێهێشت.

پاش لێدانی زەنگی دەرگاکە بە ماوەیەك، حـاجی هـەمزە دەرگـای حەوشـەکەی لـە رووی سمۆ کردەوە و بە گەرمی بـەخێرهاتنی لێکـرد، هـەر چـەندە حـاجی بـە رواڵـەتی هەڵوەستەکانی وەك مرۆڤێکی دڵرەق خۆی نیشان دەدا، بـەڵام لـە راسـتیدا کابرایـەکی میهرەبان و دڵ ناسك بوو، دەکرێت ئەو بۆ لە خۆترساندنی ئاغا و پیاوەکـانی، هەمیـشە بەو رەنگە خۆی دەردەخست، دەکرێتیش ئـەو تایبەتمەندیـەی لـە رووداوە دڵتەزێنەکـەی کوڕە جوانەمەرگکەی بۆ مابێتەوە، چونکە لە کاتی جاحێڵییدا، کـە تاقـە خوشـکەکەی پاش ئەوەی چەندین جار بۆ خۆشەویستەکەی هاتنە خوازیینی و بە هـۆی دەسـتێوەردانی کارەکە لە لایەن ئاغاوە، هەردوو بنەماڵەکە رێك نەکەوتن، کچەکەش ناچار بوو لە گـەڵ هەمان ئەو کوڕە گەنجە خۆی بە رەفاندن بدات و ئابرووی بنەماڵـەی ببـات... ئـیتر لـە چوار برا، حاجی هەمزە کە گەورەکـەیان بـوو، بـۆ تۆڵەکردنـەوە و بـە دەسـتهێنانەوەی شەرەفی بنەماڵەی، خۆی بەخشی و بەدوایاندا سەفەری کوردستانی رۆژهەڵاتی کرد، بـە هاوکاری دۆستانی ئەو قادر ئاغایە بە ناونیشانیان کـەوت، لـە شـەوە زەنگێکـدا خـۆی گەیاندە بەر پەنجەرەی ماڵەکەیان و گوێی بۆ قسەکانیان شـلکردەوە... خوشـکەکەی بـە

تورەیی هاواری لە پیاوەکەی دەکرد و دیگوت: ئاخر نازانم تۆ بۆ ئەوەندە ترسنۆکی، ئەوان لە ولاتێك و ئێمە لە ولاتێکی تر، پێم نالێیت لە چی دەترسی و بەردەوام ئەم تفەنگە ژەنگدارە دەخەیتە بن سەرینەکەت؟!... کەچی پیاوەکەی بە دەنگێکی نارامتر دەیگوت: ئافرەت لەو سەری دونیاش بین، من لە براکانت بێ منەت نابم، مەسەلەی نامۆس مەسەلەیەکی گەورەیە، براکانیشت من دەیانناسم، هەموویان شێرە پیاون، بە دووری نازانم گەر ئێستا لە بەفروبارانی ئەم شەوەزەنگە، لە پاش ئەم پەنجەرەیە بۆسەیان بۆ ئێمە دانەنابێتەوە.

گوایە لە گەڵ ئەو قسەیە، حاجی هەمزە دڵی نەرمبۆتەوە و هەردووکیان لە گەڵ خۆی گەڕاندۆوەتەوە دێیەکە و پارێزی لێ کردوون، گوایەش ناکۆکیەکەی نێوان ئەو و ئاغاش هەر لەو رۆژەوە دەستی پێکرد... ئەو رۆژەش، پاش ئەوەی ئەو گرێ کوێرەیەی ئاخی کرایەوە و بکوژی کوڕی بۆ ئاشکرابوو، دڵی حەسایەوە، چونکە لە سەر زاری ئەو، کاتێك ئەو شەوە لە گەڵ مام مەجید و مەلا بە سواری جێبەکە گەڕانەوە، ئەو زیاتر لە هەر کەسێکی ئەو گوندە هاوەڵی باوکی ئەو کوڕە ناتەبایە بوو و تاقە کەس بوو کە ئاگای لێیان هەبوو، هەر پاش بارکردنیان و دەرچوونیان لە گوندەکە، باوکی بە دەستی خۆی کوڕەکەی کوشت و تەرمەکەیشی لە چۆڵێدا شاردبۆوە.

سمۆ ناچار بوو، تاکو مام مەجید و مەلا سالح لە گەرماوە گشتییەکە بگەڕێنەوە، لە گەڵ حاجی هەمزە لە سەر تەختە دامەکە دانیشێت، حاجیش لە گەڵ ریزکردنەوەی داشەکان وجووڵاندنەوەی سێ چوارێکیان، گەمەکەی بە ئاسانی لەو لاوە پەشووکاوە دەبردەوە و داشەکانی سەر لە نوێ ریزدەکردنەوە، سەرئەنجامیش لە لاوازیی گەمەی سمۆ بێزار بوو؛ بە تەنگاوی ماوە ماوە ناوڕی لە کاتژمێرەکە دەدایەوە و بە تورەیی:

- خوا بتگرێت کەلاکی بۆگەن، بە درێژایی مەلایەتی خۆت، ئەوەندەی ئەم چەند رۆژە خۆت نەشووشتووە و........

لە گەڵ ئەو هەڵچوونە، زەنگی دەرگاکە هات، سمۆ بێ تەواوکردنی گەمەکە، مۆڵەتی لە حاجی وەرگرت و بۆ دەرەوە راپەڕی، هەر بەڕێوە سویچەکەی لە مام مەجید وەرگرت و جێبەکەی بە خێرایی لێخوڕی... ماوە ماوە لە گەڵ بەردانی قیژینێك، بە توندی

مستێکی لە سووکانەکە دەدا و تەماشایەکی ئاسمانی دەکرد و هاواری خودای دەکرد، بە یەکجاری نوقمی ناو لێکدانەوەی رووداوەکان ببوو... ئەوەیە ئەنجامی لە خودا لادان، چەندین جار خۆی لە سەر زاری مەلای دێیەکەیانی بیستبوو، کە خواردنەوە کاری شەیتانە و مرۆڤ تووشی نەهامەتی دەکات، تاکو سەری خەڵك نەشکێنێت، یاخود ئەو سەری نەشکێت، حاشای لە گشت بنەماڵەی کرد و رووی لە شار کرد، کەچی ئەوەتا لێرە گەورەترین گوناهی ئەنجام دا، جوتیار و هەژار هەردووکیان درۆ دەکەن، گوایە کوشتنی مرۆڤی ستەمکار خێرە و گوناه نییە، ئەی ئەگەر راست دەکەن ئەوان بۆ بە کارەکە هەڵنەستان؟! پاشان ئەو بەستەزمانە دانی بە هەموو گوناهەکانی نا، کەچی باسی لە دەستدرێژیەکەی بۆ سەر بنەماڵەی جوتیاری نەکرد، ئاخر کێ دەڵێت ئەو هەمان ئەو عەولایە بوو کە تاوانەکەی ئەنجامدا؟... بەو بیرکردنەوەیە، گەیشتە بەردەم دەرگای ماڵەکە، تەنیشتی جێبەکەی لای ئەفەری دایە دیواری حەوشەکە، ئەوەك دراوسێکان بە ئاگابێن، ئەویرا هۆڕن بەکاربێنێت، هێواش دەرگاکەی کردەوە و دابەزی و دەرگاکەی دانەخستەوە، لە گەڵ لێدانی زەنگەکە، ئاوڕی لە دەوروبەری خۆی دایەوە وخێرا خۆی خستەوە ناو جێبەکە، سەیری سەر دیواری حەوشەکەی کرد، چاوی لێ بوو تەرمەکە فڕێبدرێتە پشتەوە، کاتەکە زۆری خایاند، لە چاوڕوانی هاروهاج بوو، بە هەمان شێوە جارێکی تر دابەزی و زەنگەکەی لێدایەوە و گەڕایەوە شوێنی خۆی، دیسان هیچ رووی نەدا، ناچاربوو ئەو جارە مەکینەکەی کوژاندەوە ودابەزی، ئەوجارەیان دەرگای جێبەکەی داخست، زەنگەکەی لێدایەوە، هەر کە دەرگاکە نەکرایەوە، سەیرێکی دیوارە بەرزەکەی کرد، دیوارەکە زۆر بەرزبوو، هەژار هەر جارێك بڕە پارەیەکی دەستکەوتبوایە، یەکسەر لە زیادەکردنی دووسێ ریزی دیوارەکە خەرج دەکرد، ئیتر دیوارەکەش بە قەد بنایەی خانووکە بەرزببۆوە، ناچار بوو پێیەکی خستە سەر قەمەرەی جێبەکە، دەستی گەشتە سەر دیوارەکە و گوڕێکی لە خۆی داو ئاودیووی ناو حەوشەکە بوو، لە سەرخۆ لە دەرگای خانۆکە نزیك بۆوە، بە وردی گوێی شلکردەوە، هەژار لە گەڵ بەردانی پێکەنینێکی گەرم، دەیگوت:

-	خوا بتكرێت عەولا... پیاو نازانێت بۆ ئەم سەربردەیەت، بگرییت یان پێبکەنێت !!

لە گەڵ بیستنی ئەو قسەیە، ماوەیك بە حەپەساوی نوقمی ناو بیرکردنەوەی بوّوە، وای زانی هەژارە و ئەوەتا گاڵتە بە لاشەی مردووەکان دەکات، لە حەژمەتا بە تووڕەیی دەرگاکەی پاڵدا و بەتەنگەتاوی و پەشێوی خۆی کوتایە ژوورەوە، ویستی بۆ یەکەم جاری بەرووی هەژار هەڵشاخێت وتامەزرۆیی گیانی بشکێنێت، بەڵام هەر کە هەرسێکیانی بینی و وەك جاران پێکەوە لە گەڵ خواردنەوە بە گەرمی رادەبوێرن، لە شوێن خۆی گەشکەیی بوو، ماوەیەکی زۆر لە شوێن خۆی وەك پەیکەرێك چەقی و جوڵەی نەما، هەژار بە زەردەخەنەیەکی دەستکردە ئاوڕی لە عەولا دایەوە، بە پێکەنینەوە و بە رواڵەتی گەمەکردن بەرەو سمۆ رۆیشت کە هێشتا لە حاڵەتی گەشکەیی دابوو، بە یەك شەقازللە ئەو بەستەزمانەی لە گەڵ زەوی درێژکرد و لەو خەوە ناخۆشەی بە ئاگای هێنایەوە، هەر کە سمۆ هۆشی هاتەوە بەر، ئەوەك لێدانەکە دووبارە بێتەوە، پەنای بۆ عەولا برد و لە تەنیشتی دانیشت و پێکەکەی لێ خواردەوە، عەولاش بە نیمچە سڵبوون رووی کردە هەژار و:

-	خوا هەڵناگرێت تۆ ئەم زللەیت بۆ وەشاند؟!

-	ئەم هەتیووە توشی ناخۆشیەکی دەروونی هاتووە، ماوە ماوە واقع بە جێدێڵێت و نوقمی ناو دنیای خەیاڵ دەبێت و مەگەر بە شەقازللە بە ئاگابێتەوە.

هەژار بەو زللەیە دڵی کەمێك داهاتەوە، گەڕایەوە شوێنی خۆی و پێکەکەی بە یەك قووم خواردەوە و جگارەیەکی داگیرساند، بە تووڕەیی لە سمۆی حەیتاند و:

-	هەستە بڕۆ پەرداخێك بۆ خۆت بێنە.

سمۆ کە بەو لێدانە، بە تەواوی لە باری گەشکەیی خۆی بە ئاگاهاتبۆوە، بە زیندووبوونەوەی عەولا خەریك بوو لە خۆشییا هەڵهەڵەیەکی ژنانە هەڵبدات، بە فڕین لە شوێن خۆی راپەڕی، پەرداخێکی هێنا وهەر لە شوێن خۆی دانیشتەوە، عەولاش بە

شارەزایی خۆی، پەرداخەکەی بۆ داگرت و ناو و پارچە سەهۆڵێکی خستە سەر، ئینجا دەستی لە ملی ئالاند و رووی کردەوە ئەوانی تر:

- هەر چەندە زۆر شل و خاویشە، بەڵام سەد خۆزگە منیش وەك ئەو بوامە، دوێنێ شەو دڵم چوو خۆم لە خاچی ژێر زەمینەکە هەڵواسم، ئێوە خەوتان لێ کەوتبوو، ناچار بووم داوای یارمەتیم لە سمۆ کرد، ئەویش بە دەستە نەرمەکانی داوەکەی بەستەوە، بەڵام هەر کە داوام لێکرد دووسێ بزمار بێنێت و لە دەست و قاچم بچەقێنێت، وەك شێتێکی تۆقاو، لە قیژەی داو لە ژێر زەمینەکە دەرپەڕی.

دیار بوو، کە قسەکانی سمۆ نیوە بە نیوە راستبوون، ناحەقی نەبوو لە ژێر کاریگەری ترسی هەڵوێستەکە و زۆر خواردنەوەکەی ئەو شەویش، شپرزە بێت و واقع و خەیاڵ تێکەڵی یەکدی بکات، هەژار لە لێدانەکەی ژیوان بۆوە، بە رووخساری پەشێمانی، بە لاچاوێك سەیری کردەوە، پاڵی بە قاپە ژاژیکەکەی خۆی نا بەردەمی و:

- وریابە بێ خواردن ئارەق نەخۆیتەوە، ئەگینا هەناوت هەمووی دەسوتێنێت.

ئەمەی گوت و بێ پچڕانی قسەکانی، رووی کردەوە عەولاّ و بە سەرسامی:

- ئەری بە راست، مام عەولا، لە سەر قسەی سمۆ، تۆ دوێنێ شەو دەرکەوتی و درەنگانێك گەڕایتەوە!!

- ها؟! نا هیچ نەبوو، کەمێك دڵم تەنگ بوو و ویستم هەوایەکی فێنك هەڵمژم.

- هەوای چی مام عەولاّ؟! بە سەری مامە ئەمرۆ لە خەستەخانەکە باس هەر باسی بتڵەکەی تۆ بوو.

لە گەڵ بیستنی وشەی بتڵ، عەولاّ بەزم و رەزمەکەی هاتەوە پێش چاوی، خۆی بۆ نەگیرا و پێکەنی، ئیتر تێکڕا دایان لە قاقا و بەزمێك و لە گەڵ لێکدانی پێکەکان بە یەکجاری خەمیان بە بادا، عەولاّ کە هێشتا بە تەواوی خۆی بۆ نەدەگیرا و ماوە ماوە بە روویەکی شەرمینەوە لە کەنینی دەدایەوە و چاوانی پڕ فرمێسك ببوو:

- ئەو رۆژەی لێك دابراین و ئێوارەیەکی درەنگ گەڕامەوە، کۆڵانێکی چۆل و هۆل بوو، لە.پرێکا لە نێوان شیپانەی دەرگای حەوشێکا، بە دەنگێکی نزم کەسێك بانگی کرد، کە چوومە پێش، پیرە سارام بینی و بە ئەسپایی گوتی: شەوێك وەرە، فاڵەکەم

گرتووتەوە، مژدەیەکی یەکجار خۆشم پێیە، بەڵام لە بیر نەکەیت بتڵێکی بە تاڵ بێنـە... ئیتر تا دوێنێ شەو ئەو هەڵەم بۆ رەخسا، کەچی کە خۆم خستە ژوورەوە، نە ئەو تـاس و نە ئەو حەمام، سارا بە چاوە کلڕێژەکانی، قژە بڵاوکراوەکەی، کراسێکی سووری تـەنك و تەنگی پۆشی بوو، هەموو ئەندامەکانی جەستەی وەك کچێکی چواردە ساڵ دەردەخست، هەر چەندە کەمێك مەستیش بـووم، بـەڵام سـەرەتا هـەوڵم دا ئـارەزووە شـەیتانیەکەم بشارمەوە، بە پەشێوی ناو لەپەکانم بۆ کردەوە تـا خوێنەوەیـەکی هێڵـەکانم بـۆ بکـات، کەچی ئەو داوای کرد هێڵەکانی خوارەوەم بـۆ بخوێنێتـەوە، ئـیتر منـیش لـە مەبەسـتی گەیشتم و نەمکردە نامەردی و غیرەتم نایە بەر و تا لە ئارەقە تەڕبووم گەوزاندم، پاشـان هەر لە سەر داوای خۆیشی، بتلکەشم بۆی چەقاند.

هەر کە قسەکانی تەواو بوون، تریقەی پێکـەنین لـە هـەموو گۆشـەکان بـەرز بـوّوە، بەتایبەتی هەژار کە لە ژێر کاریگەری پێکەنینەکەی کەوتە سـەر گـازی پـشت، ئینجـا پاش کەمێك بێدەنگی و بیرکردنەوە، هەژار رووی کردەوە عەولاّ و:

- باشە مام عەولاّ تۆ بۆ ئەوەندە حەزت لێیە خۆت بە خاچەوە هەڵواسی؟!

- نازانم... کاتێك تازە پێدەگەیشتم، شەوێکیان قەشەیەك میوان بوو، من لە بەر دەرگای دیوەخان دانیشتبووم، لـە سـەر داوای ئاغـا، قەشـەکەپوختەی بەسـەرهاتەکەی عیسا و مەسەلەی لە خاچدانەکەی گێڕایەوە، کەمێك هەستم بـە دڵنـەوایی کـرد، کـە مەرج نییە مرۆڤی بێ باوك زۆڵ دەربچێت.

ئەمەی گوت و پێکێکی بۆ خۆی و سمۆی دروست کـردەوە، جگارەیـەکی داگیرسـاند، ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا، درێژەی بە قسەکانی دایەوە و:

- لـەبناری چـیاکە، هـەوارێکم وێـران کـرد, خونـچە خێزانێکـی خەنجیلانـەم هەڵوەرانـد... منـداڵێکی وەك خـۆم چـارەڕەش کـرد، هەمیـشە پەنجـەکانی لـەناخم دەچەقێنێت و هەست و نەستە مردووەکانی دەروونە هەرسیاویەکەم زیندوو دەکاتـەوە... بۆ ئەوەی هەتا هـەتایی بنـاڵێنم ولـە گـەڵ نەهامـەتیم بتوێمـەوە، ناهێڵێـت ویـژدانم بمرێت... تۆ بڵێی ئێستا لە کوێ بێت؟... ئاخ کە پەرۆشم دەسـت بەئـەژنوو بەرامبـەری بچەمێم و پەشێمانیم دەربرِم.

لە گەڵ ئەو دانپیانانە، بە رووخسارێکی خەمۆکی، دەستی بە گێڕانەوەی وردودرشتی تاوانەکە کردەوە، بۆ یەکەمجار لە گێڕانەوەی بە سەرهاتەکانی، ماوە ماوە لە پرمەی گریانی دەدا و دلۆپەی فرمێسکەکانی دەکەوتنە ناو پەرداخەکەی... جوتیار بە یەکجاری لە گەڵ گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە تواوبۆوە، کارەساتەکەی وەك خەونێك دەهاتەوە بیر... نەیدەزانی ئەو تاوانبارە چۆن سزا نەدرا... کەسێکی تری نەبوو، مامێك، خاڵێك، یان ئەو گوندە پان و بەرینە، مرۆڤێکی بوێری لێ نەبوو بەرامبەر ئەو تاوانە گەورەیە ویژدانی بجوڵێت و هەڵوێستێکی جوامێرانە بنوێنێت؟... کەمێك هەستی بە خۆشی دەکرد کاتێك مەلا جارو بار بۆ دڵدانەوەی دەیگوت: کە تاوانەکەمان خستە بەردەم ئاغا، وەك بەچکەشێرێك خەنجەری شوانەی باوکت لە دەستدا بوو، بە گەرمی هەوڵت دەدا خۆت لە دەست جووتیارەکان رزگارکەیت و بۆ تۆڵەسەندنەوە پەلاماری ئەو دڕندانە بدەیت... مام مەجیدیش دەیگوت: من هەواڵەکەم گەیاندە دەسەڵات، پاش لێکوڵینەوەو بەدواداچوونێکی لاواز، لە بەر نەبوونی بەڵگە کێشەکە دژی نادیار داخرا... لە راستیدا زۆربەی دەسەڵاتدارانیش ئەوکاتە دۆستی ئاغا بوون، ئەو چەند کادرەی لە سەرەتادا ویستیان بە رواڵەتی لاساربوون خۆیان پیشان بدەن، سەرکێشیەکەیان زۆری نەخایاند و هەر کە بەشی خۆیان لە تالانەکە دەستکەوت، دەست بەجێ ملکەچبوونەوە.

پێش رووداوەکە بە چەند رۆژێك، مەلا سالح و هاوسەرەکەی لەو گوندە نیشتەجێ ببوون، زۆر ئاشنابیان لە گەڵ خەڵکی گوندەکە نەبوو، بەتایبەتی بنەماڵەی جوتیار، بگرە مەلا سالح ئەو پیاوەی بە زیندووی هەر نەدیتبوو، چونکە ئەو خاوەن مەڕو ماڵاتێکی زۆر بوو، رەشماڵەکانیان لە دوورەوەی گوندی، لە ناو لەوەڕگاکەی بنار چیاکە هەڵدابوو و تێیدا نیشتەجێ ببون، لە سەر قسەی خەڵکانێکی خوداناس، باوکی جوتیار، زۆر بە مەردی و رەوشت بەرزی دەنگی دابۆوە... لەگەڵ رووداونی تاوانەکە، مەلا و ژمارەیەك پیاوانی ئەو دێیە بەخێرایی بەرەو شوێنەکە رۆیشتن... تابلۆ خوێناوییەکەیان بەچاوانی خۆیان بینی... جێی داخبوو، جێگایەکی چۆڵ و هۆڵ، جگە لە منداڵێکی تەمەن پێنج ساڵی، کەسی تری لێ نەبوو تاکو وردودرشتی رووداوەکەیان بۆ بگێڕێتەوە... ئەوەی لە دواندنی تێگەیشتن، هەر ئەوەندەبوو، کە پیاوێك ئەو تاوانەی

ئەنجام داوە، بۆیە پێش ئاشتنی هەردوو تەرمەکە، منداڵەکەیان لە باوشی خۆیان کرد و هەموو پیاوانی گوندیان پێ نیشاندا، هەر کە پەنجەی تاوانی بۆ کەسێکیان درێژ نەکرد، لە سەر قسەی مەلا بەرەو کۆشك و تەلاری ئاغا بە خێرایی هەنگاویان نا... تاوانەکەیان خستە پێش چاوی... ئەویش بانگی لە تێکرای پیاوەکانی کرد و هەموویانی ریزکردن وئەو دەرفەتەی بۆ منداڵەکە رەخساند تاکو تاوانبارەکە دیارکات، منداڵەکەش هەر کە چاوی بڕیە عەولا بێ دوودڵی پەنجەی بۆ درێژکرد... ئاغا ماوەیەك ناوچاوانی خۆی لە عەولا گرژکرد، بە هەڵچوونەوەیەکی دەستکردە، بەرچێڵی گرت و چەند هەنگاوێك دووری خستەوە،پاش مشت ومڕێکی دوو لایەنی، ئاغا گەڕایەوە لایان و بە توڕەیی: عەولا نکوڵی دەکات... کەسێك ئەوی لەوناوچەیە بینیوە؟!... مەلا سالح بە گەرمی: بەڵێ ئاغا، ئەم منداڵە. ئینجا ئاغا بە پێکەنین گوتی: مەلا منداڵ کەی بەشایەد دەچێت؟!... مەلا ئەو کاتە هێشتان بە باشی شارەزای کەسایەتی ئەو ئاغایە نەبوو، وایدەزانی ئاغا لە ساویلکەیی خۆی ئەو قسەیە دەکات، بۆیە بۆ دەرخستنی دووربینی خۆی، زیاتر لە ئاغا نزیك بۆوە ولە سەرخۆ گوتی: خەمت نەبێت ئاغا، یاسایەك هەیە لەم تاوانە بکۆڵێتەوە و راستییەکان ئاشکرا کات... هەر کە ئەمەی گوت، ئاغا وەك کۆڕەمارێك نازڕیا و بەهەڵچوونەوە رووی تێکرد و: مەلا، تۆ هێشتا بارەکەت لەسەر پشتێ کەرە، پێش نیشتەجێ بوونت، باش بزانە لێرە بەس شەریعەتی ئاغا کاردەکات... ئیتر ئەو ستەمکارییە، کاریگەریەکی خراپی لە سەر دەروونی مەلا سالح کردبوو، لە لایەك هیچی لە دەست نەبوو، تا بەرووی ئاغا و دارودەستەکەی بوەستێت و سەرجەم کاربەدەستانی ئەو سەردەمە دۆستی ئاغا بوون، لە لایەکی ترەوە، ئەو لە دەربەدەری و ئاوارەیی بێزار ببوو، ئیتر لە ژێر سەرزەنشتی دەروونییەوە،لە گەڵ مام مەجیدی تاقە هاوەڵە راستەقینەکەی، بە شاراوەیی، ملی خواردنەوەی گرتبوو، زۆر جار بە مام مەجیدی دەگوت: ئینجا ئەم گوناهەمان بەرامبەر گوناهە گەورەکە چی دەگەیەنێت؟!... بێگومان مەبەستی مەلا، لەو قسەیە، کە چەندین جار لە کاتی خواردنەوەی لە گەڵ مام مەجید، دووبارە و سێبارەی دەکردەوە، ئەوە بوو کە بەرامبەر ئەو تاوانە گەورەیە نەیدەوێرا لە ترسی ئاغا هەڵوێستێکی جوامێرانە بنوێنێت، کە ئەو

هەموو مەڕ و ماڵاتەشیان تاڵانکرد، هەر ئەوەندەی لە دەست هات لە وتاری جومعەکـە پیرۆزی سەرمایەی هەتیووەکان دووپاتکاتەوە... مـام مەجیـدیش کـە یـەك بـە خـۆی، هەستی بە شەرمەزاری دەکرد، ئەویش بە سەرخۆشی وەك سەرزەنشتێك، دەیگوت: ئـاخ کە مرۆڤ بوونەوەرێکی سەیر و خۆپەرستە، هەرکە چاوم بەو منداڵە لێقەوماوەکەوت، لە جیاتی بیر لە مافی تۆڵەکردنـەوەی بکەمـەوە، بـیرم لـەوە دەکـردەوە، کـە خـودا ئـەو منداڵەی وەك پاداشتێك بۆمن و خێزانمی ناردووە... کە جوتیاریش گەورە بوو، جاروبـار لە هەمان مەیخانە لە گەڵیان دادەنیشت، ئـیتر بـە تـەواوی وردودرشـتی بـە سـەرهاتی دڵتەزێنی بنەماڵەکەی پێگەیشت و بەردەوام ئاگای لە بکوژانی دایك و باوکی هەبوو... هەمو جارێك لە کاتی خواردنەوە، جوتیار هـەمان پرسـیاری دووبـارەدەکردەوە: ئـەرێ مەلا، ئێستاش ئەو عەولایە هەر لای ئاغایە؟... ئەویش هـەر لـە سـەر خواردنەوەکـە، سەری بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوە و: مەگەر خوا تێکیان بەردات.

ئەو کاتە ئەو لە تەمەنی پێنج شەش ساڵی دابوو، لـە لقێکـی درەختەکـەی نزیـك کانیەکە جۆلانەیەکی خەنجیلانەیان بۆ بەستبوو، بە رووخۆشی لە سەرخۆ دەجوولایـەوە، بە پێکەنینێکی ساویلکانە سەیری شەڕی هەردوو کەڵەشێرەکانی ئـەو و بـاوکی دەکـرد، کـە هەمیـشە بـە هانـدان و پـشتگیری دایکـە خۆشەویـستەکەی، کەڵەشـێرەکەی ئـەو سەردەکەوت... لە پڕێکا لەگەڵ هاوار و قیژانێکی دڵتۆقێنەر راچڵەکی و لە جۆلانەکـەی کەوتەخوار، کاریگەری قیژانەکە نەیهێشت گرنگی بە ئازاری کەوتنەکەی بدات، یەکسەر هەستایەوە و بەرەو رەشماڵەکەیان بازیدا... بە تۆقاوی بەرامبەر دیـمەنێکی ترسـناك لـە شوێن خۆی چەقی، کابرایەکی پشت پان و رەشکەڵە، لە پشتەوە بە بازوو زبەلاحـەکانی، بە توندوتیژی ناو قەدە زراوەکەی ئەو ئاسکە نازدارەی گرتبـوو و هـەوڵی دەدا بـە لێـوە رەشەکانی بن سمێڵە بۆرەکەی، هەنگوینی گەردەنی هەڵمژێتە ناو دەمە بۆگەنەکەی، ئـەو بەستەزمانەش لە گەڵ پاڕانـەوە، هـەوڵی دەدا رزگـاری بێـت و بـۆ دەرەوەی رەشماڵەکـە رابکات، کەچی ئەو، بە پاڕانەوەیەکی جۆشتر، تکای دەکـرد تـا خـۆی بداتـە دەسـتی و گڕکانی ئاخی دامرکێنێتەوە، ماوەیەك بە دڵەڕاوکێ بەرامبـەر ئـەو دیمەنـە دڵتۆقێنـەرە راوەستا و لە نێوان دوو هەستی هاودژ واقی ورما، لە لایەك ترسی ئەو ئەژدەهایە، کـە

خەریك بوو زەندەقی لیّ بچیّت، لە لایەکی دی بەزەیی بۆ خۆشەویستترین مرۆڤ... هەر لە سەر سك، دریّژی سەر زەویی کرد و دەستی بۆ دامانی کراسەکەی برد تاکو هەلّیداتەوە وناسکی جەستەی دەربخات، ئەو کاتە بە هەستیّکی شاراوە، ئەویش گوریّکی هیّنایە خۆ و پەلاماری ئەو زۆردارەی دا، هەولّی دا چەپۆکە رەشەکەی لە جەستە پیرۆزەکەی دایکی دوورخاتەوە، ویستی وەك پەرژانیّك لە رووی بچەقیّت، وەك کۆسپەیەك تەگەرە بخاتە بەدکاریەکەی، دەیویست بە هەر شیّوەیەك ئەو نیچیرە بەستەزمانە لەو ئەژدەهایە رزگار بکات، ئامادە بوو خۆی قوربانی دایکی بکات، بە پەنجە نەرم و نۆلّەکانی پەلاماری ئەو زۆردارەی دا تا لە دایکی دوور خاتەوە... بەلاّم دعبایەکە کە لە ژیّرکاریگەری گەرمی ئارەزووە قوولّەکانی ناخیدا، چاوانی تاری ببوون و رەچاوی ئەو منداڵە ساوایەی نەدەکرد، لەو هەولّ و تەقەلاّیەی جارس بوو، زۆر بە دلّرەقی زللەیەکی وەشاند و بە سەختی لە نەستوونی رەشماڵەکەی دا... ئیّش و ئازاریّکی زۆری پیّ گەیاند... بەلاّم ناڵە ناڵە و هاوار و پاڕانەوەی دایکی زیاتر دەروونی ئازار دەدا و نەیدەهیّشت هەست بە جەستە زامدارەکەی بکات... دووبارە، بە شپرزەیی ویستی جەستە هەرەشیاوییەکەی لە سەر قاچە بچکۆلاّنەکانی گیر کاتەوە و هەلّمەتیّکی تری بۆ ببات، بەلاّم سەرنەکەوت... خەریك بوو بەرامبەر ئەو دیمەنە دلّی لە لیّدان بوەستیّت... دەست و قاچەکانی دەلەرزین... ناچار، بە سکەخشکیّ خۆی لیّیان نزیك کردەوە و بەدلّەراوەکی و پاڕانەوە رووی کردە پیاوەکە و: واز لە دایکم بیّنە... کەچی دعبایەکە زیاتر نوقمی ناو دەریای ئارەزووە پیسەکانی ببوو... بۆ تیّرکردنی دامانی، جلّەوی حەز و ئارەزووە شەهوانییە بیّ سنوورەکانی شل کردبوّوە. بۆ تیّرکردنی دامانی بەسمیّلە پیسەکەی هەموو پارچەیەکی ئەو جەستە پاك و قەشەنگەی بۆگەن دەکرد... پەریزادەیەکە و دەیویست قووتی داتە ناو ورگی و وشکاتی دەروونی پیّ فیّنك کاتەوە... دەیویست ئەو گیانە پیرۆزە هەلّمژیّتە ناو بۆشاییە رەهاکەی ناخی و گیانە ئالّۆزەکەی پیّ نووژەن کاتەوە... دەیویست خۆی تیّرکات، بەلاّم تینی دامانی گڕکانیّك بوو، بە ئاوی هەموو کانی و رووبارەکان نەدەکوژرایەوە... ئەو دەیزانی ئەو ئەژدەهایە ئازرپایە و مەگەر بە پلیشاندنی میّشکی کزبیّتەوە... وازی لە پاڕانەوە هیّنا و پەنای

بردەوە هەردوو دەستە چکۆلەکانی و بە مست دارِسایەوە سەرو مێشکی... پەنجەکانی سڕ بوون و لە پەك کەوتن، کەچی کەللەی ئەو دەعبایە گەرم و رەقتر ببوو... دایکی تا ئەو ساتەش خۆی نەدابوّوە دەست, بەتوندی لە گەڵ ئەو سەگە هارە دەجەنگا, هاواری بۆ خودا و پێغەمبەر و ئەولیاکانی دەبرد و بانگی شوانەی هاوسەری دەکرد و دەیقیژاند... کە ناوی باوکی بیست، هەستی بە تیشکێکی هیوا کرد... هەموو هێزە پەرت پەرت کراوەکانی کۆکردنەوە و جارێکی تر توانی لە سەر قاچەکانی بوەستێتەوە... بە شڵەژاوی رووی کردە بناری چیاکە و هەواری بۆ باوکی برد، کە بە ژەنینی شمشاڵەکەی خەریکی چەراندنی مەڕەکانی بوو... بە پەلە پەل و چەواشەبوون خۆی لە ئامێزی داو دەستی بە گریانێکی شێتانە کرد... باوکەش بە نیگەرانییەوە هەوڵی دا ئارامی کاتەوە... هەر کە بەترس و لەرزەوە دەستدرێژیکەی پێڕاگەیاند... باوکە شمشاڵەکەی فڕێدا و دەست بەجێ خەنجەرەکەی هەڵکێشا و بە بازدان بەرەو بنەگەکەیان نشێوو بۆوە، ئەویش بە رواڵەتێکی تۆقێنراو شوێن پێی باوکی کەوت و بە دوایدا رایکرد... ماوەیەکی زۆری خایاند، تا گەیشتەوە شوێنەکە، بەرامبەر تابلوویەکی خوێناوی سەرسام راوەستان... تاوانبارەکە بە چاوێکی قاییم و زۆر بێ شەرمانە لە دیار تەرمێکی بێ سەروبەر, جەستەیەکی رووت و لەخوێن گەوزێنراو، خەنجەرە خوێناویەکەی دەسڕییەوە، بە بێڕێزی رووی کردبووە شوانەی باوکی و: ها شوانەی بێ ئاگا... دڵت توندکە, بەم دیمەنە هەڵمەخەڵەتێ, راستە دەبوایە بێ ئاگادارکردنەوەی تۆ ئەم کارەم ئەنجام نەدابوایە، بەڵام بڕوابکە جێگای داخە کە ئەو هەلەم بۆ نەڕەخسا، هەرچۆنێك سەرتانم بەرزکرد،لە ئابرووچوونتم رزگارکرد، ئەم دێڵە نەك هەرشایستەی کوشتن بوو، بگرە دەبێ تەرمە بۆگەنەکەیشی بسووتێنرێت, ئەمەیە سزای داوێن پیسی، دەبێ بکرێتە پەندی زەمانە بۆ هەموو ئەو ژنانەی نیازی ناپاکیان هەبێت و رەچاوی ئابرووچوونی کەس و کارانیان نەکەن و سەرشۆڕیان بکەن، پێش ساتێك لە سەر فەرمانی ئاغا هاتم بۆ ئەوەی پێتان راسپێرم کە سبەی هەندێ میوان لە شارەوە دێن، تاکو دەستکاری ماستی ئەمڕۆ و بەیانی نەکەن و هەر هەمووی بۆ ماڵی ئاغا بنێرن... بەداخەوە رووبەڕووی هەڵوێستێکی رالێنەبینراو بووم، ئەم دێڵە سەگەم لە ئامێزی پیاوێکی نەناشنادا گرت... غیرەت گرتمی

و زەوی و ئاسمانم لێ سەرووژێر بوون... خۆم پـێ ڕانـەگیرا، پـەلاماری هـەردووکیانم دا، ویستم بەم خەنجەرە بیانهەنجێنم، بەڵام بە هاوکاری ئەم دێڵەیـە کابرایەکـە خـۆی قورتـار کرد و منیش درێغیم نەکرد و بەشی هەردووکیان خەنجەرە پۆلاییەکەم لـەم دڵـە پـیس و بۆگەنە چەقاند و ویستم..........

شوانە کە تا ئەو کاتەش، بە شپرزەیی جار جار لە تەرمەکەی دەڕوانی، جار جـاریش چاوەکانی دەبڕیە دەمی تاوانبارەکە و بەدوای لاوازتـرین بەهانـەی تاوانەکـەی دەگـەڕا، بەڵام هەر کە هیچ هۆیەکی بۆ ئەو تاوانە نارەوا و بـێ ویژدانـەی دەسـت نەکـەوت، لـە تەرمەکە نزیك بۆوە و ناوچاوانی ماچکرد و رووی کردەوە تاوانبارەکە و: سەگە, دەمـت داخـە, خـۆ بـەخۆڕایی ناویـان نـەناوی سـەگ, بنەماڵـەی تـۆ تـەنها لـە ژن و سـەگێك پێکهاتبوو, پرسیاری خەڵکی ئەم ناوچەیە و دەوروبەری بکە، دایکـت تـا دوا هەناسـەی شووی نەکرد و ئیتر کەپەیدابووی هەر ئەو سـەگ و ئـەو قەحپەیـە باوانـت بـوون...... بەهەمان شێوە, ئەویش نەیهێـشت بـاوکی جوتیـار قـسەکانی تـەواو بکـات... لەگـەڵ بیستنی ناوی دایکی و لەوتاندنی رەسەنایەتی، جارێکی تـر ئازرِیایـەوە و خەنجەرەکـەی بەرزکردەوە و پەلاماری باوکی دا، بە سەختی رووبـەرووی یـەکتر بوونـەوە، بـەڵام زۆری نەخایاند، خوێنی ئەویشی تێکەڵی خوێنی دایکی کرد، ئـەویش بەرامبـەر ئـەو دیمەنـە دڵتۆقێنەرە لە هۆش خۆی چوو !!.

لە گەڵ بیرکردنەوەی کارەساتەکە، جوتیار بەردەوام فرمێـسکەکانی دەسـڕیەوە، هـەر کە عەولاّ قسەکانی تەواو بوون، ئەو بە تێڕامانێك کە بەزەیی وسـووکایەتی پێـوە دیـار بوون، رووی کردێ و:

- کەواتە داوای لێبوردنی لێ دەکەیت؟
- بەڵکو پێی دەڵێم ئەمەیە ئەو خەنجەرەی دایك و باوکتی لە خـوێن گەوزانـد... پێی دەڵێم دەست هەڵێنە و ئەم سەرە بۆگەنەم لە نێوان هەر چوار کێلەکان هەڵواسە!.
- ئەی ئەگەر نەیکوشتی؟
- پێی دەڵێم شەرم بکە... تۆ ناتوانی مریشکێك سەر ببڕی.

ماوەیەك بێ دەنگی... جوتیار لە سەرخۆ:

- کەواتە ناکرێت ڕۆمانەکە تەواوکەم ، تا تۆش سزا نەدرێیْ !!

هەژار بەنیگادزە، سەیرێکی دەم و چاوە پەشـووکاوەکەی عـەولاّی کـرد و لـە گـەڵ فڕکردنی پێکەکەی:

- واتە چۆن حەزبکەیت، خۆت دەتوانی کۆتایی بە ڕۆمانەکەت بێنی !!

عەولاّش لـە گـەڵ فڕکردنـی پێکەکـەی و داگیرسـاندنی جگارەیـەکی تـر، ئـاخێکی هەڵکێشا و بەداماوی:

- خۆزگە جارێکی تر ئەو منداڵەم دەدیتەوە، ئەوسا کۆتاییەکە زۆر ئاسان دەبوو!!

- سمۆ بگرن !!

هەر کە شاگردە نوێکە، بۆ دانانی پیاڵە چایەکان خۆی چەماندەوە، هەردووکیان بە پێکەنین سەیری یەکدییان کرد و پێکەوە ئەمەیان گوت و جارێکیتر لە تریقەی پێکەنینیان دایەوە، شاگردە بەستەزمانەکە، ماوەیەك بە ساویلکەیی لە دیار سەریان وەستا و گوماناوی بیری لەو هەڵسوکەوتە پێکەنیناوییە و ئەو دەستەواژە نامۆیەی کردەوە، هەر کە لە مەغزاکەی تێنەگەییشت، بە رواڵەتی کەمترخەمی خەندەیەکی بەردا و بەرەو چایخانەکەی گەڕایەوە.

ئەو بەرەبەیانە، بۆ یەکەمجار هەردووکیان بە گورج و گۆڵی لە خەو ڕاپەڕین، لە گەرماوە گشتیەکە خۆیان شوشت، هەر لە چێشتخانەکەی تەنیشت گەرماوەکەش، بە چلێسی و دڵبردن پاچەیەکی بە لەزەتیان خوارد، هەژار پارەی خواردنەکەی دا و بە رووگەشی بەرەو پەرتووکخانەکە گەڕانەوە، هەر بە ڕێگاوە چاویان بە پیرە سارا کەوتەوە، بە شێوازە سەیر و سەمەرەکەی، بە رواڵەتێکی نائاسایی، خەریکی خوێندنەوەی بەختی گەنجێکی تری پەست و خەمۆکی بوو کە بە داماوی سەری بۆ شۆڕکردبووە، بە دزیەوە هەر لە نزیکەوە گوێیان بۆ چرپێنەکەی شلکردەوە، وەك دەروونزانێکی شارەزا، نوقمی ناو کانگای ناخیەوەی ببوو، بە دەنگێکی هێمن و پڕ سەدا،حەز و نارەزووە شاراوەکانی بۆ دەورووژاندنەوە، هۆکارە نهێنیەکانی پەستی و چەوسانەوەی بۆ ئاشکرا دەکرد، هەڵە دۆڕاوەکان و بە سەرهاتە دڵتەزێنەکانی تەمەنی منداڵیی وەبیردەهێنایەوە، بە لێڵی و تەم و مژی ئاماژەی بە ئاسنامەی ئاحەزە شاردراوەکانی دەکرد، ئینجا بۆ گەشبینکردنەوەی، هێز و توانا شاراوەکانی بۆ دووپات دەکردەوە، ڕێگای خێر و خۆشیەکانی بۆ دەخستەوەبەر، ئیتر هەمان پێشبینی و رمڵ لێدانەکەی جارانی بوو، کە رۆژانە دەیچرپاندە گوێچکەی هەردووکیان و مژدە خۆشەکەی بۆیان دووپات دەکردەوە، هەژار بە ساختەچیی و لە پڕێکا حەپەساندی:

- شوکور بۆ خوا پلە سارا وا دیارە برینەکەت سارێژ بۆتەوە؟!

لە گەڵ بیستنی ئەو پرسیارە شەرمینە، سارا بە شەپرزەیی دەستی گەنجەکەی بەرداو هەستایەوە سەر پێیانی، بە رووشکاوی تەماشایەکی هەردووکیانی کرد، بە بیرکردنەوەیەکی کەم قسەکەی وەرگرت و تێی گەیشت، بۆ دڵنیابوونەی لە نەبوونی عەولا، ئاورێکی راست و چەپی دایەوە، ئینجا بە رواڵەتی نەفامی و بە سەر لەقاندن وەڵامی دایەوە و خێرا لە شوێنەکە دوورکەوتەوە.

ئەو بەیانییە، زۆر بە تاسەوە بیری سمۆیان دەکردەوە،پێش دوو هەفتە، باوك و براکانی سمۆ هاتن، بە تکا و پاڕانەوە و هاوکاری عەولا کە پێدەچوو هەر خۆی پلانەکەی دارشتبێت، ئەویان رازی کرد، تا لە گەڵیان بگەڕێتەوە، بەڵام بە دوو مەرج، یەکەمیان باوکە شەڕانیەکەی بە تەلاق سوێند بخوات، کە لەمەودوا لە لایەن منداڵێکی گوندەکەش دەستدرێژیی بکرێتە سەر، ئەو نابێت دەستهەڵێنێت، مەرجی دووەمیش ئەوە بوو، هەر لە گەڵ گەڕانەوە، دەستبەجێ ژنی بۆ بێنن، هەڵبەت مەرجی دووەمیان جێبەجێکرد، بەڵام بۆ مەسەلەی شەڕنەکردن، باوکە لە سێ رۆژ زیاتر بەرگەی نەگرت، بەڵام بۆ ئەوەی تەڵاقەکەی نەکەوێت، ناچاربوو ئەوجارەیان شەڕەکە بفرۆشتە ئەو بەقاڵە بەستەزمانە، کە چەند رۆژ جارێك بە جێبەکەی سەردانی ئەو گوندەی دەکرد، کە جارەکەی تریش ئەگەر پیاوەتی.ئەو نەبوایە، کە بەخۆڕایی و بێ بەرامبەر سمۆی زامداری گەیاندە خەستەخانەی شار، ئەوەتا ئێستا لە گروپی رەحمەتیەکاندا بوو.

جوتیار قومێکی لە چایەکەی داو جگارەیەکی داگیرساند و پارچەیەکی تری داشەکانی شەترنجەکەی گواستەوە، بە نیگەرانی رووی کردە هەژار و:

- دوێنێ شەو، خەونێکی سەیرم بینی !!... عەولا بەدڵچوون خۆی دایە دەست دادگا و بە خەفەتباری دانی بە هەموو تاوانەکانیدا نا... بە رووخۆشی هەر خۆی پەتی سێدارەی لە ملی خۆی ئالاند، من زۆر بۆی نیگەران بووم، بە شپرزەیی هاوارم کرد و قیژاندم و ئیتر لە خەو هەستامەوە !!

- راستە ئەم مرۆڤە لاپەڕەکانی رابوردووی هەمووی هەر رەشن... بەڵام پەشیمان بوونەوەی، گاڵتە و پێکەنینەکانی، بەسەرهاتە دڵتەزێنەکەی منداڵی و ئەو کەش و

هەوایەی تیایدا پەروەردە کرابوو، ئیتر چەندین هۆکاری تر، وامان لێ دەکات بەزەییمان بۆ خۆی ڕابکێشێت.

- هەرگیز وێنای ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیەم نەدەکرد... من بەدوای عەولایەکی خوێنمژ و داوێن پیس دەگەڕام... کەسێکی دڵڕەق و درۆزن، کە هەمیشە هەوساری هۆشی لە دەست حەزو و ئارەزووە پیسەکانی نابوو... کەچی ئەو خۆی کەسایەتی جارانی خۆی کوشت و خەریکە ئێمەی جارانیش بکوژێت !!

- لە ڕاستیدا کوشتنی ئەو سەگە چێژی جارانی نەما !!.

- هەرچۆنێك بێت، جارێ واز لەم چیرۆکە بێنە... ئێستا پێم بڵێ، زڕباوکت چۆن قایل بوو بە خۆی و خێزانەوە بێنەوە لات؟!

- منیش نازانم، بەڵام هەست دەکەم وەك بڵێن کەسێك زۆری لێ کردبێت، ئەویش هاتنەوەکەی بە دڵ نەبوو، ئەمەیان گرنك نییە، ئیتر زڕباوکایەتی هەر وا دەبێت، گرنگ ئەوە، هاتنەوە لای من و بە فرمێسکی شادی خۆمان لە ئامێزی یەکدی دایەوە... ژیانێکی تر... بۆ یەکەم جار هەست بە خۆشی ژیان بکەم... باوڕ بکە ئەو شەو لە لوتکەی بەختەوەریدا دەژیام، ئیتر لە خۆشییا نەخەوتم و بە دەم گۆرانی تا بەرەبەیان سەمام کرد و.....

لە گەڵ بیستنی دەنگی کڕیارێك، کە پرسیاری نرخی پەرتووکێکی دەکرد، قسەکانی پچڕاند و بەرووخۆشی بەرەو پیری چوو و:

- نرخەکە گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە بەدڵت بێ!!

- لەسەری نوسراوە نیو دینار.

نەك بە دەستێك، بەڵکو بە هەردوو دەست، هەژار کتێبەکەی پێشکەشکرد و:

- حەز دەکەم بەدیاری بیبەی؟

نرخەکەی وەرگرت و گەڕایەوە سەر تەختەی شەترەنجەکە... بەرامبەر ئەو هەڵسووکەوتە ڕاڵێنەبینراوە، جوتیار بەسەرسامییەوە:

- ڕاستە دەڵێن خۆشەویستی وەك گوڵێکی بۆندارە !!

ئەمەی گوت و سەیرێکی کاتژمێرەکەی دەستی کرد، لەگەڵ بزواندنی پارچەیەکی تر، درێژەی بە قسەکەی دا و:

- ئەم سەگە بەدواکەوت و منیش........

قسەکەی تەواو نەکرد، کەللە زلەکەی عەولاَ بە دیارکەوت، بە دەستێك گۆنیەکەی سەرملی گرتبوو و بەدەستی تریشی کارتۆنێکی گەورەی خستبووە بن ملەکەی تری، هەر کە بارەکەی دانا، گەڕایەوە بەر دەرگای دوکانەکە و تاخمە چایەکی بانگکرد، پاشان بە بێتاقەتی گەڕایەوە ژوور و کارتۆنە کتێبەکانی لە جوتیار نزیك کردەوە و هەر بە پێوە:

- ئەمانە هەموویان رۆمانن !!

ئەمەی گوت و لیستی نرخەکانی دایە دەست هەژار، ئینجا گەڕایەوە و کتێبەکانی ناو گۆنیەکەیشی دەرهێنان و خەریك بوو لە سەر تەختە و دەلاقەکان دابەشیانکات... هاوکات زڕباوکی هەژار، بە گەرمی بەرامبەریان بە دیارکەوت و خەریك بوو پێ بنێتە ناو دوکانەکە، بەڵام هەر کە پشتە ئەستوورەکەی عەولاَی بینی، کە هێشتان خەریکی بلاَوەکردنەوەی کتێبەکان بوو، لە شوێن خۆی چەقی و راچڵەکی، هەر کە هەژار و جوتیار، چاویان پێکەوت، دەستبەجێ لە شوێن خۆیان هەستانەوە و بەگەرمی پێشوازییان لێکرد و داوایان لێ کرد بێتە ژوور، بەڵام ئەو خێرا، بەلاچاوێك سەیرێکی تری عەولاَی کرد و بە زەردەخەنەیەکی دەستکردە و هەر بەرێوە و بە دەنگێکی نزم:

- دوایی دەگەڕێمەوە !

ئەمەی گوت و بە پەلە پەل لە شوێنەکە دوورکەوتەوە، ئەوانیش بە سەرسامی لە سەر تەختەکانیان دانیشتنەوە، خۆنەویستانە بەرامبەر ئەو هەڵوەستەیە، هەردووکیان بیریان لە قسەکانی سمۆ کردەوە... ئەو جارەی پێکەوە بۆ زەماوەندەکەی، سەفەری دێیەکەیان کرد، سمۆ لە خۆشی بەشداربوونی ئەو دوو هاوەڵەی، وازی لە قەرەباڵغەکە هێنا، بەرەو شوێنە دڵرەفێنەکانی ناو رەز وباغ و کانیەکانی بردن، هەر بەرێوە پرسیاری عەولاَی لێ کردن، بە بەزەیی ئەو دوا هەڵوێستەی بۆ باسکردنەوە، ئەو ئێوارەیەی کاتێك ئەو و عەولاَ و هەژار پێکەوە بەرەو ماڵەوە دەگەڕانەوە، ویستیان لە شەقامە سەرەکییەکە بپەڕنەوە، لە ناوەندی رێگاکە، هەر کە هەژار چاوی بە دایکی کەوت، کە

بەرامبەریان لە گەڵ پیاوەکەی لە سەردانی پزیشکێك دەهاتنە دەر و لە سەر شۆستەکە تێپەڕین، لە پڕێکدا بە پەرۆشی لە شوێن خۆی چەقی، خەریك بوو تووشی ڕووداوێکی جەرگبڕ بێت، بەڵام عەولا بە چاوترووکانێك لاچەملێکی گرت و لە ئوتومبێلەکەی دوورخستەوە، هەر لە سەر شۆستەکە، ئەو و دایکی دوور بە دوور، ماوەیەك بە تاسەوە چاویان بڕییە یەکدی، دایکە هەر چەندە بە پاڕانەوە ڕووی کردە پیاوەکەی و دەست بە سینگەوە خوڕخوڕ فرمێسکی ڕشت، بەڵام ئەو دڵڕەقە بە توندی لێی حەیتاند و ملی گرت و دایەوەی پێش خۆی، لە سەر قسەی سمۆ، بەو بەدئاکاریە خرۆشاویە، عەولا زیاتر لە هەر کەسێك، فرمێسکی ڕشت و چاوەکانی سوور هەڵگەڕان، بە توڕەیی ملی سمۆی گرت و پرسیاری ماڵ و شوێنکاری ئەو کابرایەی لێکرد... ئیتر هەر چەندە هەردووکیان لە گەڵ ئەو بیرکردنەوە و لێکدانەوەیە دەگەیشتنە هەمان دەرئەنجام و لاچاوە ڕەش و شینەکەی ئەو کابرایەش، کە هێشتان شوێنەواری دارنینەکەی هەر مابوو، هەمان گریانەکەی دەسەلماند، بگرە عەولا جارێکیان لە کاتی خواردنەوە، بە ڕاشکاوی ئامادەیی خۆی بۆ هەژار دەربڕی بۆ لە ناوبردنی ئەو زڕباوکەی، بەڵام هەژار سەرەڕای سەرخۆشیی پێی گوت: ئایە ئەگەر ئەو تاوانە ئەنجام بدەین، هەمو ئارێشەکان چارەسەر دەکرێن؟... من تەنها مەبەستم گەڕانەوەم بۆ ئامێزی دایکم نییە، بەڵکو ئەو خوشك و هەردوو برایانەی لەو زڕباوکەن... زۆرم خۆش دەوێن، ئەوانیش منیان خۆش دەوێت، لە ترسی ئەو، ناتوانین هاتووچۆی یەکتر بکەین، بەڵام تۆ بڵێی ئەگەر باوکیان بکوژم، خۆشەویستییان لە دەست نەدەم؟!... ئیتر مەسەلەکە تا ڕادەیەك ئاشکرابوو، بەڵام هەر چۆنێك، بۆ زیاتر دڵنیایی و سەلماندنی بۆچوونەکان، ئەمەیان لە گەڵ عەولا، پێویستی بە دانیشتنێکی تر هەبوو.

هەژار سەرەتا بە نوزەچاو لە لیستەکە وردبۆوە،بەڵام هەر کە کۆی ژمارەکانی بینی، بەمەئدەهۆشی چاوێکی بە نرخەکاندا خشاندەوە، لە گەڵ خوراندنی چەنەگەی، ماوەیەك کەوتە بیرکردنەوە، پاشان بە توڕەیی ئاوڕێکی لە عەولا دایەوە و:

- ئەی ئەو ناپیاوە جاران بۆ نرخەکانی زیادتر دەکرد؟!

- من یەکەجار لە شوێنەکانی تر، پرسیاری نرخەکانم کرد، پاشان ئەوم ناچارکرد نرخەکان زیاتر دابەزێنێت.

لە گەڵ ئەنجامدانی کارەکەی، بیێ ئاوڕدانەوە، ئەو قسەیەی کرد، هێشتا تەواو نەببوو، لە گەڵ دەنگی پیاڵەکان، ئاوڕی دایەوە، هەر کە چاوی بە شاگردەکە کەوت، ماوەیەك بە بەزەیی چاوانی تێبڕی و هەر بە پێوە چایەکەی خۆی وەرگرت،لە گەڵ تێکدانی چایەکە، ماوەیەك لە دیار سەریان راوەستا، بە تامەزرۆیی:

- باشە من سەرم لەم گەمەیە دەرنەچوو، لە لایەك لە دامە دەچێت و لە لایەکی تر، بزواندنی داشەکانی جیاوازن؟

هەژار لیستەکەی نوشتاندنەوە و خستیەی ناو گیرفانی، بێ سەربەرزکردنەوە :

- ئەخێر ئەمە شەترەنجە.
- لە دامە دەچێ !
- ئا، بەڵام رێساکانیان جیاوازن.
- چۆن جیاوازن؟
- پرسیارێکی سەختە... وەڵامدانەوەی سەختترە !!
- ئەمەیان چ مەتەڵێکە؟
- مەتەڵ نییە... بەڵام ناتوانم چۆن چۆنی تێتبگەیێنم... دەکرێت بڵێین دامە جەنگێکی نێوان دوو هۆزە، کەچی شەترەنج جەنگی نێوان دوو شانشینە...
- هەمان بەزمەکەیە، لێرە چەرۆکەکە بە کوشتنی پاشا کۆتایی دێت و لەوێش بەکوشتنی ئاغا.

ئەمەی گوت و بە پەرۆشەوە رووی کردەوە جوتیار و:

- هەر کە رۆمانەکەت تەواوکرد، من خۆم چاپی دەکەم، خاوەن ئەو چاپخانەی دوو کۆڵان لە پشتمانە، ئێستا زۆر برادەری منە و بە نرخێکی هەرزان بۆمان چاپ دەکات؟!

جوتیار مژێکی درێژی لە جگارەکەی دا ولە گەڵ بەردانی دووکەڵەکە، بەدڵنیایی لە سەروسیمای وردبۆوە و:

- چاپکردنەکە گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە ئەمشەو دەبێت هەر تەواوی بکەم !!

عەولا بە تامەزرۆیی:

- بەڕاستیتە؟... ئەی کۆتاییەکەی؟!

- پەلە مەکە... با ئەم شەو دانیشتنەکەمانی پێ برازێنینەوە !

- کەواتە ئەم شەو لای مام ڕەزۆ میوانی منن !!

- نا، خواردنەوەکەی ئەم شەو، با لە دەرەوەی شار بێت !!!

کۆتایی